# قەدەر

## لە ڕووناکیی "قورئان" و "سوننەت"دا





محمد فتح الله گولەن
دایناوە

فاروق رسول يحيى
کردوویە بە کوردی

ئەم کتێبە:




- زانای پایەبەرز مامۆستا (محمد فتح الله گولەن) بە زمانی تورکی دایناوە.
- مامۆستا (ئیحسان قاسم صالحی) لە تورکییەوە وەرگێڕاوە بۆ عەرەبی.
- (فاروق رسول یحیی) لە عەرەبییەوە کردوویە بە کوردی.
- چاپی یەکەم: (١٤٢١ك - ٢٠٠١ز).

# قەدەر

## لە ڕووناکیی "قورئان" و "سوننەت"دا


زانای پایەبەرز

**محمد فتح اللّٰه گولەن**

دایناوە

فاروق رسول یحیی

کردوویە بە کوردی

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## وتەیەکی پێویست

سوپاس و ستایشی هەتاهەتایی و شایان بۆ خوای گەورە و، دروودی نەبڕاوەی ئەو خواوەندەش بۆ سەر گیانی پێغەمبەری خۆشەویست و سەروەرمان حەزرەتی محمدی ئەمین ﷺ و بۆ گیانی سەرجەم ئال و یاران و شوێنکەوتوانی.

چەند ساڵێك پێش ئێستا مامۆستای بەڕێز (ئیحسان قاسم سالحی) ئەم کتێبەی لە تورکی‌یەوە کردبوو بە عەرەبی و، پاشان بەوپەڕی لەخۆبوردەیی وتەوازوعەوە داوای لێ کردم پێش چاپکردنی کتێبەکە بە دارشتنی وەرگێڕانە عەرەبی‌یەکەی‌دا بڕۆمەوە و لەو لایەنەوە پێشنیارەکانم بخەمە ڕوو. منیش بەڵێنم دا کە خواستەکەی بهێنمەدی و کتێبەکەی بۆ بخوێنمەوە.

لێتان ناشارمەوە کە یەکەم جار بەو نیازەوە دەستم بە خوێندنەوەی کرد. بەڵام دوایی کە هەر جارەو لاپەڕەیەکی نوێم لێ دەخوێندەوە پتر نرخ و بەهای کتێبەکەم بۆ دەردەکەوت و زیاتر وەڵامی پرسیارەکانی خۆمم بە ڕوونی تێدا دەبینی‌یەوە کە لە مێژە لەناو کتێبەکان‌دا بە دوایان‌دا عەوداڵ بووم! بۆیە ئەم کتێبە سەرنجی ڕاکێشام و، ڕوخسەتی وەرگێڕانیم لە مامۆستای ناوبراو وەرگرت و، بە پشتیوانیی خوای گەورە دوای کەمتر لە ساڵێك دەستنووسی ئەم وەرگێڕانە کوردی‌یەشمان هێنایە بەرهەم. بەڵام لەو ساتە وەختەوە هەر بۆ دەرفەتێك دەگەڕێم لەچاپی بدەم و خوێنەرانی بەڕێزیش بە زمانی کوردی سوود و بەهرەی لێ وەربگرن. وا ئێستا خوای گەورە ئەو دەرووەشی کردەوە و، بەم شێوەیە خستمانە بەر دیدی ئێوەی خوێنەری بەڕێزەوە، بەو هیوایەی کە سوودی چاوەڕوان کراوی بۆ ئێوەش تێدا بێت و، دوعای وەرگرتن و لێخۆشبوونیش بفەرموون بۆ دانەری کتێبەکە و وەرگێڕی هەردوو زمانەکە و هەر کەسێکی تریش کە ڕۆڵی ئیجابیی لە ئامادەکردنی ئەم بەرهەمەدا بووە.

وصلى الله على سيدنا محمد النبي الأمي وعلى آله وصحبه وسلم.

والحمد لله رب العالمين.

**فاروق رسول يحيى**

بسم الله الرحـــمن الرحيم

# پێشەکی

هەر لە دێر زەمانەوە مەسەلەی "قەدەر" بە جێی پێ‌هەڵخلیسکان دانراوە. بۆیە زانایانی ئیسلام تەنها گرنگترینی بناغەکانی "قەدەر"یان بە ئایەت و فەرموودە پیرۆزەکان و بە چەشنێکی پوخت و کورت خستووەتە ڕوو، بێ ئەوەی خۆیان لە قەرەی لایەنە قووڵ و پەرش و بڵاوەکانی بدەن، تاکو خەڵکی عەوام و نەشارەزا لەو ڕێگا پێچاوپێچانەی قەدەردا سەرگەردان و ون نەبن کاتێ بیر لە درێژەپێدانە وردەکانی قەدەر دەکەنەوە یان لێیان دەکۆڵنەوە.

بەڵام ڕۆژ لە دوای ڕۆژ "بیری ماددی" لە سەرانسەری جیهاندا بە ڕادەیەك پەرەی سەند کە بوو بە بناغەی سیستەم و ڕژێمی هەندێ دەوڵەت و، بەردی بناغەی خوێندنیش لە ئاستی سەرتاسەری جیهاندا. هەر لەم کاتەدا زەنگی مەترسی و ئینزاریش لای خۆمان دەستی بە لێدان کرد؛ چونکە ئەم بیرە، وردە وردە، مەڵبەندەکانی فێرکردنی ناو جیهانی ئیسلامیشی گرتەوە و بە چەشنێك تەشەنەی کرد وەك بڵێیت شێوازێك بێت کە پێویست بێت چاوی لێ بکرێت! ئەوەبوو ئەم بیرە لە ڕێی بڵاوکردنەوەی گومان و دوودڵی‌یەکانەوە، گیانی ڕەخنەی لە ناوەندە گشتی و تایبەتی‌یەکاندا گەشە پێدا و، ماددی‌یەکانیش بابەتەکانی قەدەریان قۆزتەوە و وەك بوارێکی لەبار و زەوی‌یەکی نەرم‌ونۆڵ و بەکەڵك بۆ ئەو مەبەستە بەکاریان هێنا و، بە هەموو هێزێکەوە هێرشەکانیان لەوێوە ئاراستە کرد، لە کاتێکدا کە موسڵمانان خۆیان لە تاوتوێ‌کردن و لێدوانی ئەو چەشنە باس و بابەتانە دەپاراست و دوورەپەرێزی‌یان لێ دەکرد.

خۆ ئەم وەچە نوێ‌یانەی ئێستا کە لە خوێندنی ئایینی بێ‌بەش کراون و لێی دابڕاون، تابڵێیت لاواز و بێ‌چەك و بێ‌پارێزگارین لە بەرامبەر ئەم هێرشە سەخت و چڕانەدا. بۆیە بە سەرسامی و سەرگەردانی مانەوە، تەنانەت بەشێکی زۆریشیان نەیانتوانی هێندە خۆیان ڕابگرن کە پارێزگاری لە خۆیشیان بکەن و نەکەونە خوارەوە بۆ ناو گێژاوی ئینکاری و سەرسەختی!

دیارە حاڵی بەرە(جبهة)ی ئێمەش لە شوێنەکانی تر باشتر نەبوو، چونکە پێشتر خۆی بۆ ئەم زۆرانبازی و ململانێ‌یە ئامادە نەکردبوو، هەروەك ئەو زانیاری‌یانەش کە هەر لە

مێژە لە لامـان کەلەکە بووبوون هیـچ سـوودێکیان تێدا نەبوو لـە ڕووبەڕووبوونەوەی چەکە نوێکانی هێرشی ئێستادا. ئەمە جگە لەوەی کە بـەرەی بەرامبەرمان: (یەکـەم) بـە چەشـنێکی ڕێکخراوی ورد و بـە کەسـایەتی‌یەکی مەعنـەویی جیهانی‌یـەوە هـاتبووە پێشـەوە و.. (دووهـەمیش) ئامـانجی ئـەو تەنها ڕووخـاندن و کاولکـاری بـوو لـە بریـی ئاوەدانکردنەوە، کە ئەمەیان کارێکی قورس و دژوارە و.. (سێ‌هەمیش) تەوژمی ئیلحاد هێندە بـەهێز و پەرەسێن بـوو کـە بـە وێنـەی پەتا بڵاو دەبووەوە و بـە خێرایی تەشـەنەی دەکرد.

کەواتە ئەو دوو "بەرە" دژ بە یەکە لەم ململانێ‌یەدا هاوتای یەکتری نـەبوون، بـەڵکو بەرەی ئەولا خاوەنی کێش و قورسایی‌یەکی لەبەرچاو بوو، ئەمـەش هـانی غیرەتمـەندان و کەسانی خاوەن ویژدانی دا کە خەمی چارەنووسی نەتەوەکەمان بخۆن، بە تایبـەت کاتێ کە ئەم بیرە بە وێنەی گڕگرتنی پووش و پەڵاش لەناو چینەکانی خەڵکی‌دا پەرەی سەند و تەنانەت چایخانە و کۆڕە گشتی‌یەکانیشی گرتەوە.

ئا لـەم کاتـە ناسـك و سـەختەدا، زانـای مـەزن و پایەبـەرز مامۆستا "محمـد فتـح الله گولـەن" لـە شـێوەی پرسـیار و وەڵام و گفتوگـۆدا دەسـتی دایـە ئامۆژگـاری و پێشکەش‌کردنی وانە و ڕێنمایی‌یەکانی و، لە گۆڕەپانێکی یەکجار فراوانی کـارکردن‌دا بۆ ئەم مەبەستە لـێ برا، هەر لە کورسیی وەعز و ئامۆژگاریی مزگەوتەکانەوە بۆ چایخانـە گشتی‌یەکان کە لە هەموو شوێنە جیاجیاکانی شاردا بـڵاون و، تا دەگاتـە ناوەنـدەکـانی زانکۆ و چینەکانی ڕۆشنبیران. ئێمـە لـەو شایەتانەین کـە ئـەم کـارە سـەروەر و خزمەتـە مەزنەیمان بە چاوی خۆمان بینـی، چونکـە هـەر پرسـیارێك لـە هەرکەسـێکەوە و بـە هـەر شێوازێك و بێ دوودڵی ئاراستە بکرایە، یەکسـەر وەڵامـی تێر و تەسـەل و شیفابەخشـی ئەو پرسیارەی دەدرایەوە، بە تایبەت ئەو پرسیارانەی کە لە بابەتەکانی قەدەرەوە ئاراسـتە دەکران و بەهۆی ئەو تەم و مژەی کە بە سـەریانەوەیە، دەبن بەمایـەی پێ‌هەڵخلیسـکانی ئەوانـەی لێـی دەدوێن. هـەموو ئـەو وەڵامانـەش هێنـدە ڕوون و ئاشـکرابوون توانی‌یـان چڵکی ئەو گومان و دوودڵی‌یانە لابـەن کـە لـە ژیری و زەینـەکان نیشتبوون، هـەروەك بیرەکانیشیان لە چەپەڵی‌یە سەر لـێ‌شێوێنەکانی گشـت جۆرەکـانی "گومڕایی" خـاوێن دەکردەوە. بـە چـاوی خۆمـان ئـەو ئاڵوگۆڕانـەمان دەبینـی کـە لـەو خەڵکـەدا بـەرچاو دەکـەوت، چونکـە سـەرجەمی ئـەم دانیشـتنانە بەگوێ‌پێ‌نـەدان و پشـت گوێ‌خسـتنی باسەکان لە لایەن دانیشتووانەوە، بە تایبەت لە چایخانەکان‌دا، تەنانـەت هـەندێ جـار بـە دەربڕینی ڕێز لـێ‌نەنان و گوێ‌ڕانەگرتن، یان بەرپەرچدانەوەی دەسـتکرد و غەلبەغـەڵب

دروست‌كردن، ئەو كۆڕانــە دەستی پێ دەكـرد، بـەڵام پـاش ماوەیـەك و وردە وردە دانیشتووان دەبوون بـە گوێبیستی جیددی و ئینجا كش‌ومات بۆ گوێڕاگرتن لەو گفت‌وگۆیانە دادەنیشتن، دەت‌وت باڵندە بەسەریانەوە نیشتووەتەوە!

ئـەو پرسـیار و وەڵامانـەش لەســەر شـریتی كاسـێت تۆمـار دەكـران و پاشـان دەستاودەستیان پێ دەكرا و، لەم ڕێیەوە خوای گەورە گەلێ كەسـی سـەرگەردانی لـە زۆنگاوی گومڕایی دەرهێنا و، ئنجا ئەوانیش بوون بەهۆی ڕزگاربوونی هاوەڵـەكانیان. چونكە ئەو قسە و گوفتارانەی كە لەو گفت‌وگۆیانەدا ئاراستە دەكران چەند وشەیەكی سارد و سڕ و تەعبیری وشكی مەنتیقی و بێ گیان نەبوون، بەڵكو چەند "بەر"ێك بوون كە درەختی دڵێكی خەمبار گرتبوونی و بە فرمێسكەكانی چاوێك ئاودێری كرابوون كە لەناوچوونی تەواوەتیی "جیل"ێكی بەدبەختی بینیبوو، ئەو جیلـەی كـە تەسلیم‌بوون و ملكەچیی لەدەست دابوو، هەروەك بناغەكانی ڕێز و ئیحترامیشی لێك هەڵوەشـابوون و لە هەڵدێرەكانی ئینكاری و سەرسەختی‌دا كەوتبووە خوارەوە!

بەڵێ، ئەو وشـانە گـەرم‌وگوڕی و حەیەوییـەت و سـۆز و میهرەبانی‌یەكی ئـەوتۆیان لەگەڵ خۆ هەڵگرتبوو كە بوون بەهۆی گێڕانەوەی زۆر كەس بۆ لای هەست و شعوری ڕاست و دروستی خۆیـان، تەنانـەت هـانی دان ئیمـانی كەسـانی نزیكی خۆیشیان – بە ئیزنی خوا – ڕزگار بكەن.. هەروەها ئەو وشانە لەڕینەوە و ڕاچڵەكینی ویژدانێك بـوون كـە لـە دەرمانخانـەی قورئـانی حـەكیم‌دا دەرمـانێكی ئـەوتۆی هـەڵبژارد كاریگـەریی ئاشكرای بۆ چارەسەریی ژیریـی ئەوكەسـانە تێدا بێـت كـە گوفتـاری ئاراستە دەكـردن لەوانەی كە هەندێكیان تەنانەت داب و ڕێ و شوێنی پرسیاركردنیشیان نـەدەزانی! ئیتر بە وێنەی پزیشكی شارەزا و كارامە مەڵهەمی سارێژكاری لەسەر زامەكانیان دادەنا و بە سۆز و میهرێكی لەڕادەبەدەریشەوە دەرمانی شیفابەخشی پێ دەنۆشین، بە فەزڵی خـوای گەورەش چەندین ئەنجامی جوان و ڕەنگینی لە "جیهانی ڕۆح"ی گوێبیستان‌دا بەرهـەم دەهێنا.

ئـەم كتێبـەی بەردەستمان "بابـەتی قـەدەر" لـە ڕوخســارە پێناسـەیی‌یەكەی‌دا و لـە ڕووبەرێكی فراوانی بە ئەندازەی گەردوون‌دا پێش‌چاوی گوێبیستان دەخات، چونكـە ئەو ڕێسـا یەكجار وردە دەردەخـات كـە لـە سەرتاسـەری گـەردوون‌دا هەیە، هـەر لـە گەردیلە و ناوك و تۆوەكانەوە تا دەگاتە هەسارە و گەلەستێرەكان و، ڕوونی دەكاتـەوە كـە هـەموو بوونـەوەرێك هـەر لـە سـەرەتای دروست‌بوونیەوە تـەصمیم و نەخشـەی بـۆ كێشـراوە. هـەروەها دەری‌دەخـات كـە: ڕوون‌بوونـەوەی "واتـای قـەدەر" لـە نـاخی

مرۆڤدا و شی کردنەوەی نهێنییەکانی - یەك لە دوای یەك - خاڵێکی تری بنەڕەتییە لەم مەسەلەیەدا. هەروەك سەرنجیش بۆ جیاوازییەکانی چەمکی "قەدەر" ڕادەکێشێت لە لای ئەو کەسەی کە لە سەرەتای ڕێگادایە و ئەو کەسەش کە چەند قۆناغێکی دووری لە قووڵایی ئیمان و نهێنیی ئیخلاس و نقومبوونی لە خواپەرستیدا بڕیوە تا گەیشتووەتە دوا پلەکان.

جگە لەمانە، خوێنەر لەوەش ئاگادار دەکاتەوە کە زانینی هەندێ لە وردەکارییەکانی عیلمی قیافەت و شی کردنەوەی هەندێ لە نهێنی و ئەرکەکانی ماهییەتی ڕۆح لە ڕێی ڕوخسار و سەروسیمای مرۆڤەوە، ئەویش هەر لە بابەتی قەدەرە.

لە لایەکی تریشەوە بوار بە بەشی "ویستی مرۆڤ" دەدات کە شتێکی هەندەکی و لاواز و گوێڕەیییە. لە هەمان کاتدا ئەهلی بەصیرەت لە پێوەر و حەقیقەتی شایەتیدانی "ویجدان" تێ دەگەیەنێت، هەر لە بەرپرسیاریی مرۆڤ لە کردەوەکانیەوە - بێ ئەوەی مافی لەخۆباییبوونی بێت - تا دەگاتە کێشەی: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾؟

لە ڕاستیدا بەنرخیی وەڵامەکان جوانییەکی تر دەهاوێتە سەر بابەتەکە.

سێ بەشی یەکەمی ئەم کتێبە، زنجیرە پەند و ئامۆژگاری و وانە و ڕێنماییەکیان لە خۆدا کۆکردووەتەوە کە دانەری بەڕێز بەسەرپێیییەوە ئاراستەی کردوون و ڕاستەوخۆ لەسەر شریتی کاسێت تۆمار کراون و ئنجا لەبەر کاسێتەکان نووسراونەتەوە و، پاشان خراونەتەوە بەردەستی مامۆستای دانەر، ئنجا دوای پوختەکاری و پێداچوونەوە، ئایەت و فەرموودە پیرۆزەکانیشی تەخریج کراون.

بەڵام بەشی چوارەمی ئەم کتێبە، وەڵامی ئەو پرسیارانەیە کە لە ڕێی چەند هۆکارێکی جیاجیا و لە چەند بابەتێکی جۆراوجۆردا ئاراستەی مامۆستای بەڕێز کراون.

پاشان دوای ڕێکخستنی بابەتەکانی ئەم کتێبە بەم شێوەیەی کە باس کرا، پێڕستەکانیشی بۆ دانرا و، بە تەواوەتی بوو بە کتێبێکی سەرچاوەیی.

هەرچەند ئێستا وا دەردەکەوێت کە هێرشە چڕ و پڕ و ڕێکخراوەکان ڕاوەستابن، بەڵام چرپەچرپەکانی نەفس و وەسوەسەکانی شەیتان گەلێ جار هێمنی و خاوێنیی جیهانی ناوخۆی دڵ و دەروونمان دەشێوێنن و لێڵی دەکەن، ئەمەش کارێك دەکات کە پێویستییەکانمان بەم دەرمانە شیفابەخشانە هەردەم زیاد بکەن.

لە ڕاستیدا ئەم کتێبە (قەدەر لە ڕووناکیی قورئان و سوننەتدا) تەنها وەڵامی چەند پرسیارێکی ئاراستەکراو نییە، بەڵکو بریتییە لە چەند تیشکێکی ئیمانیی ئەوتۆ کە "دڵ" و "ژیری" و "ویجدان" دڵنیایی خۆیانی تێدا دەبیننەوە.

ئالێرەوەیە کە پێویستیی گەرموگوڕ و بەردەوام بەم کتێبە هەمیشە هەر دەمێنێت، لە ڕاستیدا کارکردن لە ئاستێکی جیهانیدا بۆ ئیمان و قورئان، دوای ئەمە دەست پێ دەکات. چونکە سەرتاسەری جیهان بە تایبەت ئەورووپا و ئەمریکا پێویستیان بەم حەقیقەتانەیە کە هیچ شتێکی لە بارەوە نازانن. بۆیە - پشت بەخوا - ئەم ڕاستییانە بۆ زمانەکانی تر وەردەگێڕین، تاکو سوود بە ڕووبەرێکی فراوانتری گرۆی ئادەمیزاد بگەیەنن.

ئێمەش ئەم بۆنەیە بە هەل دەزانین کە سوپاسی گەرموگوڕ پێشکەشی مامۆستای بەڕێزمان بکەین و، نزای خێر بۆ گشت ئەو کەسانەش بکەین کە بوون بە مایەی بەرهەمهێنان و بەئەنجامگەیاندنی ئەم کارە پیرۆزە. هەروەك لە خوای گەورەی بەتوانا دەپاڕێمەوە کە تەمەنێکی بەپیت و بەرەکەت بە مامۆستامان ببەخشێت و لە تەواوکردنی بانگەوازەکەیدا سەری بخات. ئامین.

**صەفوەت سەنیح**

***

بەشی یەکەم:

# قەدەر و لایەنە جیاجیاکانی

## دەروازەیەك

"قەدەر" بریتییە لە: تەقدیر و دەستنیشانکاریی خوای گەورەی خاوەن زانیاریی ڕەها سەبارەت بە "ڕابوردوو" و "ئێستا" و "داهاتوو". ئەو خوایەی کە هەموو ئەو شتانە بە وێنەی خاڵێکی بچووك وان لە پێش چاوی دا، بەڵکو هەر هیچ شتێك نی یە کە سەبارەت بە خوای گەورە ناوی: "ڕابوردوو" و "ئێستا" و "ئاینده"ی لێ بنرێت..

"قەدەر" بریتییە لەم زانین و بینینە و، پاشان تۆمار کردنی تەواوەتیی هەرچی بووە و دەبێت، پێش ئەوەی ببێت، لە "کیتابی موبین"دا[1]. چونکە هەر تەنها خواوەندە کە بە زانست و تەقدیری خۆی دەوراندەوری بوونی هەموو شتێکی ناو بوونەوەری داوە و ئاگای لە هەموو ئەو شتانەیە کە دێنە "وجوود" هەر لە بچووکترین گەردیلەوە تا دەگاتە گەورەترینی گەلەستێرەکان و تەنانەت مرۆڤیش، پاشان ڕێکخستنی هەموو شتێك بەپێی "وجوودی عیلمی"یان و دەستنیشان کردن و پۆلێن کردن و تۆمار کردن و تەقدیر کردنیان لە لایەن خوای گەورەوە، بەوەی کە لە بازنەی "زانست"ی خۆیەوە دەریان دەهێنێت و دەیانخاتە بازنەی "توانست" و "ویست"ی خۆی. بەم کارەش ئەو بوونەوەرە دەهێنێتەڕوو لە جیهانی دەرەکی واتە لە جیهانی "وجوود"دا.

"باوەڕ بە قەدەر" یەکێکە لە شەش پایەکانی ئیمان، چونکە هەروەك مرۆڤ بە بێ گومانی و بە چەشنێکی بەدیهی باوەڕی بە "خوای گەورە و مەلائیکەتانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و زیندووبوونەوەی پاش مردن" هەیە، بە هەمان بێ گومانی و بەڵگەنەویستیش باوەڕی بە "قەدەر" هەیە. کەواتە ناگونجێ تەسەووری باوەڕ بە قەدەر لە دەرەوەی بازنەی باوەڕ بە پایەکانی تری ئیماندا بکرێت.

قەدەریش تەنها لەو شتانەدا دەکرێت ببێت بە بابەتی باس و لێکۆڵینەوە کە تایبەتن بە مرۆڤەوە، وەك ئەو بیر کردنەوە و هەڵس و کەوت و جموجووڵانەی کە کاریگەریی

---

(١) بۆ تێگەیشتن لە "کیتابی موبین" بەم بۆچوونەی ئێرە، بڕوانە: سەرجەمی پەیامەکانی نوور – بەرگی یەکەم(وتەکان) ل ٧٨٣-٧٨٤ یان پەیامی: (من) پەراوێزی ل ٤١ - ٤٣.

"ویست"ی مرۆڤیان تێدایە. دیارە هەموو ئەو بابەتانەی كە پەیوەندی‌یان بە قەدەرەوە هەیە گرنگی و بەهایان لەوەدایە كە لەمەڕ "ویستی مرۆڤ" دەدوێن، دەنا هەر شتێك لە بارەی قەدەرەوە بوترێت وەك پێناساندنی شتی ناسراوی لێ دێت. واتە كاتێ كە بیر لە مرۆڤ و ویستی مرۆڤ ناكەینەوە ئەوا هەموو گوفتارێكمان سەبارەت بە قەدەر لە واتا و ناوەرۆك بەتاڵ دەبێت. چونكە هەروەك "بوونی مرۆڤ" واتا و ڕەنگێكی بەبەر بوونەوەر پۆشیوە، بە هەمان جۆر "ویستە جوزئی‌یە"كەشی گرنگیی بە مەسەلەی "قەدەر" داوە و ڕەنگێكی تایبەتیی پێ بەخشیوە.

لەبەر ئەوە، ئێمە لەم كتێبەدا لەو قەدەرە دەكۆڵینەوە كە پەیوەندیی بە "ویستی مرۆڤ"ەوە هەیە و، لە هەمان كاتدا بە دوای وەڵامی ئەو پرسیارانەشدا دەگەڕێین كە هەر لە مێژە سەبارەت بە "جوزئی ئیختیاری" بە زەینی مرۆڤدا هاتوون.

لە خوای گەورەی بەتوانا دەپاڕێینەوە كە تێگەیشتن و تێگەیاندنی قەدەرمان ئیلهام بكات لە ڕووناكیی ئەو ڕێبازەوەی كە ئەهلی سونەت و جەماعەتی لەسەرە، هەر تەوفیقێكیش لەم چەشنە باس و لێكۆڵینەوانەدا دێتە ڕێمان هەر تەنها بەخشش و چاكەی خوای گەورەیە، هۆكاریشمان بۆ دەستكەوتنی ئەو تەوفیقەی خواوەند تەنها دەستەوسانی و هەژاریمانە.

* * *

### ١- واتاكانی قەدەر لە "زمان" و "زاراوە"دا..

قەدەر لە زمانی عەرەبی‌دا بە واتای "التقدير" واتە دەستنیشان كردن دێت. ئەوەتا دەڵێن: "قدَّرَ الشيء بالشيء". واتە: ئەو شتەی بەوی تر هەڵسەنگاند و بە ئەندازەی ئەوی لێ كرد. هەروەها دەوترێ: "قدَّرَ الأمرَ". واتە: كارەكەی سازاند و بەڕێی كرد و بڕیاری لەسەر دا. هەروەك بە واتای هێز و وزەش بەكار دێت. خۆ كاتێ كە ئەم وشەیە بە فراوانتر بەكار دەهێنرێت، ئەوا واتای: بڕیار لەسەردان و، جێبەجێ كردنی بڕیار، دەگرێتەخۆ.

ئنجا لە كۆی هەموو ئەم واتایانەوە بۆمان دەردەكەوێت كە قەدەر لە "زاراوە"ی ئیماندا بریتی‌یە لە: هەموو ئەو قەزا و حوكمانەی كە خوای گەورە دەستنیشانیان دەكات و بڕیاریان لەسەر دەدات.

ئەم ئایەتە مەزنانەی خوارەوە پشتی ئەم پێناسەیەی سەرەوە دەگرن:

﴿وعِندَهُ مَفَاتِحُ الغَيبِ لا يَعلَمُهَا إلاّ هو ويَعلَمُ مَا في البَرّ وَالبَحرِ ومَا تَسْقطُ مِن وَرَقةٍ إلاّ يَعلَمُهَا ولا حَبَّةٍ في ظُلُماتِ الأرضِ وَلَا رَطْبٍ وَلا يَابسٍ إلاّ في كتابٍ مُبين﴾(الانعام:٥٩).

﴿قُل لا أملكُ لِنَفْسِي ضَرّاً وَلانَفعاً إلاّ مَا شَاءَ الله، لِكُلّ أُمّةٍ أَجَلٌ اِذَا جَاءَ أَجَلُهُم لا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلا يَسْتَقدِمُونَ﴾(يونس:٤٩).

﴿وَمَا مِنْ غَائِبَةٍ فِي السَّمَاءِ والأَرضِ إلاّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾(النمل:٧٥).

﴿إنّا نَحْنُ نُحيِي الْمَوتَى وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وآثارَهُم وَكُلَّ شَيءٍ أحْصَيْنَاهُ فِي إمَامٍ مُبِينٍ﴾(يس:١٢).

﴿بَل هُوَ قُرآنٌ مَجِيدٌ * فِي لَوحٍ مَحفُوظ﴾(البروج:٢١-٢٢).

﴿وَيَقُولُونَ مَتَى هَذا الوَعْدُ إنْ كُنتُم صَادِقِينَ * قُل إنَّمَا العِلْمُ عِنْدَ الله وَإنَّمَا أنَا نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾(الملك:٢٥-٢٦).

قەزا و قەدەریش لە ڕوویەکەوە بە یەك واتا دێن، کەچی لە ڕوویەکی ترەوە و لە واتایەکی دیکەدا "قەدەر" هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە خواوەند تەقدیری کردوون، بەلاّم "قەزا" جێبەجێ کردنی ئەم تەقدیرەیە و ئەنجامدان و ڕایی کردنی فەرمانی ئەو دەستنیشانکارییەیە.

هەروەها "قەدەر" بریتییە لە گێڕانەوەی هەموو شتێك لە پێش بوونیدا، واتە گێڕانەوەی "وجوودە عیلمی"یەکەی بۆ خوای گەورە لە نەخشەیەکی "زانست"ی ئەودا. چونکە ئەو شتانەی کە ئامادە کراون بێنە ناو وجوودەوە و هەوڵ دەدەن جێی خۆیان لە زنجیرەی بوونەوەراندا بگرن، هەموویان لە لەوحی "کوژانەوە و نووسین"(المحو والإثبات)دا دەنووسرێن، کە لەوحێکە لە لایەن مەلائیکەتانەوە و لە ڕووی نووسینەکانی "لەوحی مەحفووظ"ەوە دەگیرێتەوە و دەنووسرێتەوە، کە ئەویش لە ناوەندی زانستی هەمەلایەنگیری خوای گەورەدایە. کەواتە "قەدەر" پێکەوەهاتنی "بەدیهێنانەکانی" خوای گەورەیە لەگەڵ "دەستکەوت"ی مرۆڤدا. واتە کاتێ کە مرۆڤ دەست دەداتە هەر کارێك ئەو کارە بە ویستی خۆی ئەنجام دەدات و خوای گەورەش بە ویستی خۆی ئەو کارەی بۆ بەدیدەهێنێت. کەواتە قەدەر بریتییە لە تەقدیری خوای گەورە بەهۆی زانستی ئەزەلی و ئەبەدیی خۆی سەبارەت بە بوونی هەموو شتێك پێش بوون و دوای بوونیشیان و چارەنووسی ئایندەشیان. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو بۆچوونەی پێی وایە: "قەدەر تەنها ناونیشانی زانستی خوایە" بۆچوونێکی ڕاست و دروست نییە. چونکە واتای قەدەر جگە لەوەی کە تەقدیر و دەستنیشانکردنی شتان دەگەیەنێت لە ڕێی "زانست"ی خواوەندەوە، ئەوەش دەگەیەنێت کە هەموو ئەو شتانە لە لایەن سیفەتەکانی تری وەك "بیستن و بینین و ویست و ئیرادە"ی خوای گەورەشەوە تەقدیر و دەستنیشان کراون. جا مادەم وایە،

ئەوا ئینكاری كردنی قەدەر لە ڕاستیدا ئینكاریی هەموو سیفەتەكانی خوای گەورە دەگەیەنێت. هەر لەبەر ئەمەشە كە بەشێكی زۆری لێكۆڵەران بابەتی قەدەریان لە ناوەندی باسی خوایەتیی خوای گەورەدا ڕوون كردووەتەوە و وتوویانە: پێویست ناكات باسێكی سەربەخۆ بۆ قەدەر تەرخان بكرێت، چونكە زەرووڕەت داخوازی ئەوەیە مەسەلەی "قەدەر" لە ناوەندی باسی "ئولووهییەت"دا پێش‌چاو بخرێت.

بەڵام ئێمە وەك ئەوان ناڕوانینە مەسەلەكە، چونكە ئەم گۆشەی ڕوانینە لەوانەیە لە ڕوویەكەوە بۆنی ئەوەی لێ بێت كە "قەدەر" لە ناوەندی پایەكانی ئیماندا دانەنرێت.

لەبەر ئەوەیە كە دەڵێین: هەروەك باوەڕمان بە "خوای گەورە و مەلائیكەتانی و كتێبەكانی و پێغەمبەرانی و زیندوبوونەوەی پاش مردن" هەیە، بە هەمان جۆر باوەڕیشمان بە "قەدەر" هەیە. ئەمەش بۆ ئەوەی گوفتارێكمان لە زار دەرنەچێت كە چ بە پوختی و چ بە دووروودرێژی و چ بە هەر شێوەیەك ئاماژەی تێدا بێت بۆ ئینكاریی "ئیمان بە قەدەر" وەك پایەیەك لە پایەكانی ئیمان.

خۆ ئەگەر ئەسڵی مەسەلەكە ڕەچاو بكەین، ئەوا دەبینین ئیمامی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل دەفەرمێ: "القدر من القدرة". كەواتە ئەو كەسەی ئینكاریی قەدەر بكات ئەوا ئینكاریی گەلێ كاروباری ئەوتۆ دەكات كە تایبەتن بە ئولووهییەتی خوای گەورەوە. واتە عەقیدەی ئولووهییەت لە دڵدا لەق دەبێت و سیستەم و بیر و بناغەی چەمكە ئیمانییەكانیش یەك لە دوای یەك لە بن هەڵدەوەشێن.

ئا لێرەوەیە كە "قەدەر" بە بابەتێكی گرنگ دانراوە. ئەوانەش كە لە ناوەندی چەمكەكانی ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا لە قەدەر نەكۆڵیونەتەوە، لە ڕێ ترازاون و دووچاری گومڕایی بوون. عەقلانییەتی موعتەزیلەكان و حەتمییەتی جەبرییەكان هەندێكن لەو گومڕایی و لە ڕێ ترازانە.

### ٢- ئەو قەدەرە "جەبری"یەی كە بەسەر گەردووندا زاڵە.

ئەو فەرمانڕەوایەی كە فەرمانی لە سەرتاسەری گەردووندا زاڵە، بریتییە لە قەدەر و تەقدیر و ڕێسا و پێكەوەگونجان و نەخشە و تەرازوو و هاوسەنگی و ڕێكی.

ئایەتە مەزنەكانی قورئان ئەم "قەدەر"ە ڕێكخەرەی گەردوونمان تێدەگەیەنن:

﴿اللهُ يَعلَمُ مَا تَحمِلُ كُلُّ أُنثى وَمَا تَغِيضُ الأَرحَامُ وَمَا تَزدَادُ وَكُلُّ شَيءٍ عِندَهُ بِمِقْدَار ۞ عَالِمُ الغَيبِ وَالشَّهَادَةِ الكَبِيرُ المُتَعَال ۞ سَواءٌ مِنكُم مَن أَسَرَّ القَولَ وَمَنْ جَهَرَ بِهِ وَمَنْ هُوَ مُستَخفٍ بِاللَّيلِ وَسَارِبٌ بِالنَّهَارِ﴾(الرعد:٨-١٠).

﴿وَإِنْ مِن شَيءٍ إِلا عِندَنَا خَزَائِنُهُ وَمَانُنَزِّلُهُ إِلاّ بِقَدَرٍ مَعْلُومٍ﴾(الحجر:٢١).

﴿وَالسَّمَاءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ الْمِيزَانَ﴾(الرحمن:٧).

بەڵێ، قەدەر هێندە فراوانە کە هەموو گەردوون دەگرێتەوە و شموولی هەموو شتێکی ناوی دەکات، بە رادەیەك کە ناتوانرێت تەسەووری هیچ شتێك بکرێت کە لە دەرەوەی قەدەردا بێت. چونکە خوای گەورەی بەدیهێنەری گەردوون بە زانینی هەمەلایەنگری خۆی تەرازوو و رێکی و رێسا و رێکخستن و ئەندازەیەکی دیاریکراوی لە هەموو شتێکدا داناوە، هەر لە چەکەرەکردنی ناوك و دەغڵ و دانەکانەوە تا دەگاتە بووژانەوەی بەهاری رەنگین و، هەر لە نەخشاندنی شێوە و رووخساری مرۆڤ لەناو رەحمی دایکاندا تا دەگاتە لەدایكبوونی ئەستێرەکان لە گەلەستێرە(مجرة) مەزنەکاندا. تەنانەت هەموو ئەو کتێبانەی کە لە سەدان هەزار دانە تێپەڕ دەبن و زانا لێکۆڵەرەکانی سەرتاسەری جیهان دایانناون، لە راستیدا، تەرجەمە و روونکەرەوەی ئەم رێسا و رێكوپێکی و تەقدیرە هەمەلایەنە و گشتگیرەن.

ئەم قەدەرەی کە بە سەر گەردووندا زاڵ و فەرمانڕەوایە، شتێکە دوور و نزیك.. دۆست و دوژمن.. ئیمانداری باوەڕدار و کافری سەرسەخت باوەڕی پێ دەکەن، تەنانەت "مارکس"یش کاتێ کە لە "حەتمییەت" دەدوێت لە راستیدا ئەم قەدەرە فەرمانڕەوایەی گەردوون پێشچاو دەخات!

هەرچەند هەندێ لە زانایانی موسڵمانی وەك "ابن خلدون" دان بە جۆرە حەتمییەتێکدا دەنێن، تەنانەت ژیانی کۆمەڵایەتیش دەخەنە ژێر رکێفی ئەو حەتمییەتە، بە وێنەی چەمکی "حەتمییەتی مێژوویی" کە لە خۆرئاوادا باوە؛ کەچی ئێمە لە ناوەندی چەمکی "ئەهلی سوننەت و جەماعەت"دا ئەم حەتمییەتە بە چەند مەرجێکی تایبەتییەوە دەبەستینەوە و بە شێوەیەکی رەها(مطلق) وەری ناگرین، مەگەر لەگەڵ ئەو مەرجانەدا. دەبێ بیشزانرێت کە ئێمە دان بە بوونی قەدەرێکدا دەنێین کە فەرمانڕەوا و زاڵە بەسەر هەموو شتێك تەنانەت بەسەر ویستی مرۆڤیشدا.

بێ گومان ئێمە کاتێ کە دەست بە بنیاتنانی پرۆژەیەك یان دروست کردنی کاتژمێرێك دەکەین، یەکەم هەنگاومان بە دانانی نەخشە و تەصمیم دەست پێ دەکەین. بۆیە لە پێشدا بە تەقدیری خۆمان حساب بۆ هەموو ئەو شتانە دەکەین کە لەوانەیە لە دوارۆژ و قۆناغەکانی ئەو کارەدا بێنە رێمان. جا لە کاتێکدا کە ئەم تەصمیم و نەخشەکێشانە لە بینایەکی ئاسایی و ئامێرێکی سادەدا ئاوا پێویست بێت، ئیتر چۆن دەکرێ ئەم هەموو سیستەم و رێسا ورد و هاوسەنگییە سەرسوورهێنەرانە بەبێ نەخشەو پلان و بەرنامە تەسەوور بکرێن کە بە هەموو بوونەوەرانەوە هەر لە گەردیلەکانەوە تا

دەگاتە مرۆڤ بە ئاشکرا دەبینرێن و لە بەرچاودان؟ ئایا بڵێیت ئەم ڕێسا ناوازەیەی کە بە گەردوونەوە دەبینرێت شان و شکۆی لە ڕێسای بینا و سیستەمی کاتژمێرەکە کەمتر بێت؟!

ناوك و تۆوەکان - لە ڕاستیدا - چەند وردیلە سندووقێکی پڕ لە "قەدەر"ن! ئەوەتا لاپەڕەکانی ژیانی هەموو تۆوێك، بەڵکو ژیانی درەختێکی تەواوەتی لەو تۆوەدا دانراوە. تەنانەت گەر ئەو ناوك و تۆوانە بخرێنە ناو خاکەوە ئەوا دەمیان بە هەزار جۆری ڕووەك و گوڵی ڕەنگاوڕەنگ دەپشکوێت، هەرچەندەش لە ڕووی پێکهاتن و دروستبوونیانەوە لە یەك دەچن و لە هەمان ماددە و کەرەسەی سادە دروست کراون. کەواتە هەموو تۆوێك کە چەکەرە دەکات و دەمی دەپشکوێت، لە بەردەم چاوی سەرنجدا ئەو پۆشاکە پێشچاو دەخات کە قەدەر بە ئەندازە و باڵای ئەوی بڕیوە، یاخود بەپێی ئەو شێوە و ڕوخسارە عیلمی و مەعنەوی‌یە پێك دێت کە قەدەر بۆی دەستنیشان کردووە. خۆ ئەگەر هەزاران کەسی بەرگدروو بە درێژایی چەندین ساڵی دووردرێژ کار بکەن، هێشتا هەر ناتوانن تەنانەت بەرگ و پۆشاکی تەواوەتیی تەنها یەك دانە درەخت بدوورن و ئامادەی بکەن، کەچی گشت درەخت و ڕووەکەکان، هەر لە سەرەتای دروستبوونیانەوە تا ئێستا، بەرگ و پۆشاك بۆ خۆیان بەرهەم دێنن. کەواتە چار نی‌یە دەبێ ئەم کارە بۆ قەدەری فەرمانڕەوا و زاڵی ناو گەردوون بگێڕینەوە، دەنا جگە لە "قەدەر" بە چی دەکرێت ئەم کارە لێك بدرێتەوە؟

بیر لەم کۆشکە مەزنەی گەردوون بکەرەوە. ئەوەتا ئەو کەسەی کە لە بەردەم تەلەسکۆبدا ڕاوەستاوە، هەموو ئەو دووری‌یە یەکجار زۆرانە دەبینێت کە ماوەی پێنج ملیۆن ساڵی ڕووناکی لێمانەوە دوورن! واتە گەر ئەستێرەی "نیبلووز" بکوژێتەوە ئەوا تەنها دوای پێنج ملیۆن ساڵ دەتوانرێت کوژانەوەکەی ببینرێت! یان گەر تۆ بۆ خۆت ببیت بە "ڕووناکی" و بتەوێت بڕۆیت بۆ ئەوێ، ئەوا دوای پێنج ملیۆن ساڵ دەتوانیت بگەیتە ئەوێ! جا ئایا ئەم گەردوونە مەزن و ڕێسا وردە، مرۆڤ تووشی سەرسووڕمان و سەرسامی ناکات؟!

لە لایەکی ترەوە دەبینین کە ئەم جیهانە فراوانە پەیوەندی‌یەکی بەتینی لەگەڵ ئەم مرۆڤەدا هەیە کە جیهانێکی بچووکە و جێنشینی سەرزەوی‌یە، بە ڕادەیەك کە ئەم پەیوەندی‌یە خەستوخۆڵەی نێوانیان "تەقدیری موتلەق" و "زانستی هەمەلایەنگر"ی ئەو خواوەندە ڕوون دەکاتەوە کە بە وردترین ڕێسا و ناوازەترین تەرازوو و ڕەنگینترین تەقدیر و کارسازی، زەوی و ئاسمانەکانی ڕاگیر کردووە. ئەوەتا ئەو پێکەوەگونجانە

ورد و ئاشکرایەی نێوان ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ دەتوانرێت لە گشت بەشەکانی گەردوونیش‌دا ببینرێت.

"جین"[١] لەسەر حەق بووە کاتێ کە وتوویەتی:

(ئەو کەسەی جیهانی گەردیلەکان و جیهانی مرۆڤ و گشت جیهانەکانی تری ڕێکخستووە، بەپێی چەندین پێوەری ئەندازەیی ورد دایناوە و نەخشەی بۆ کێشاوە. چونکە ئەندازیاری‌یەکی فەرمانڕەوا بە سەرتاسەری گەردوونەوە دەبینرێت).

جا ئایا ئەم ئەندازیاری‌یە هەستیار و وردەی کە بەسەر گەردووندا زاڵ و فەرمانڕەوایە، سەروزیاد نی‌یە بۆ چەسپاندنی بوونی ئەو خواوەندە ئەزەلی‌یەی کە گەردوونی بەپێی ئەو نەخشەیە بەدی‌هێناوە؟

با ئەم مەسەلەیە بە گوێرەی تێگەیشتنی عەوامی خەلکی پێش‌چاو بخەین:

گەر ئێوە خۆتان بۆ بنیاتنانی خانوویەك ئامادە کردبێت، با ئەو بینایە ساکاریش بێت، ئەوا بێ گومان یەکەم هەنگاوتان بەوە دەست پێ دەکات کە سەردانی ئەو کەسانە دەکەن لەو کارەدا جێی متمانە و بڕواتانن و پرس‌وڕایان پێش هەموو شتێك دەخەن. چونکە هەر هەڵەیەك لە تەقدیر کردنی ئەو بینایەدا هەبێت - با کەمیش بێت - لەوانەیە ببێت بەهۆی ڕووخاندنی خانووەکە لە کاتی تەواوبوونی‌دا. بۆیە تەقدیر کردنی ئەو حسابانە بۆ ئەو بیناکاری‌یە، کارێکی گەلێ پێویستە.

کەواتە ئەم "بینا" سادە و ئاسایی‌یە، پێویستی بە: تەقدیر و تەصمیم و نەخشەیەکی ئەوتۆیە کە لەگەڵی‌دا بگونجێت، خۆ ئێوەش هەتا پێداویستی‌یە بنەڕەتی‌یەکانی بۆ ئامادە نەکەن دەست نادەنە بنیاتنانی. تەنانەت دەبێ - زیاد لەوەش - چاودێریی ئەو نەخشە و پلانە بکەن کە بۆ ئاوەدان کردنەوەی ئەو شارەی ئێوە داڕێژراوە، هەروەك دەبێ شوێنی بنیاتنان و شێوە و دیکۆری دەرەوەی خانووەکەش ڕەچاو بکەن.. ئەمانە و شتانی تری جگە لەمانەش کە بۆ بنیاتنانی هەر خانوویەك پێویستن - با خانووەکە سادە و ساکاریش بێت - دەبێ لە سەرەتاوە ڕەچاو بکرێن.

لە کاتێك‌دا کە ئەم تەقدیرانە بۆ ئەم بینایە پێویست بێت ڕەچاو بکرێن، دەبێ بینای گەورەی فراوانی گەردوون پێویستی بە وردترین حساب و پێوەر و تەقدیر هەبێت. ئایا نموونەت لەسەر ئەمە دەوێت؟

---

(١) (جین): زانایەکی ئینگلیزە لە بوارەکانی: گەردوونناسی و بیرکاری و فیزیادا. لە نێوان ساڵەکانی: (١٨٧٧-١٩٤٦ز)دا ژیاوە. چەند کتێبێکی دوای خۆی بەجێ‌هێشتووە، هەروەك چەندین باس و لێکۆڵینەوەی جیاجیاشی ئەنجام داوە لە بارەی چۆنێتیی پێکهاتنی بۆشایی ئاسمان و گەردوون و ئەستێرەکان. (وەرگێڕ)

سەیری قاشێك "سێو" بکەن کە دەیخەنە ناو دەمتان و سەرنج لەو پەیوەندی‌یە وردەی نێوان خۆتان و ئەو قاشە سێوە بدەن: تامی سێوەکە و، دەمی ئێوە.. ڤیتامینەکانی ناوی و، جەستەی ئێوە.. تەنانەت سێبەری درەختەکەی و، پێویستیی ئێوەش بە سێبەرەکەی.. پێویستیی درەختەکەی بەو گازە ژەهراوی‌یەی کە لەگەڵ هەناسەدا دەری‌دەدەن و، پاکژکردنی هەواش لە لایەن ئەو درەختەوە و، پاشان هەوا هەڵمژین و هەناسەدانتان لە ڕێی ئەم هەوا پوخت و پاکژکراوەیەوە.. ئەمانە و سەدان پەیوەندیی تر کە - بۆ نموونە - لە نێوان "ئێمە" و "سێو"دا هەیە و لێرەدا چەردەیەکمان لێ پێش‌چاو خستن.

خۆ ئەگەر بتانەوێت ئەم مەسەلەیە لە بازنەیەکی تەسکی وەك ئەم نموونەیەدا، یان لە مەیدانێکی فراوانی نێوان ئەستێرەکاندا وەربگرن، ئەوا لە هەر هەموویاندا جگە لە: سیستەمێکی ناوازە و.. هاوسەنگی‌یەکی ورد و.. تەقدیرکاری لە هەموو شتێك‌دا، هیچی تر نابینن.

گەر سەرنج لە هەر "زیندەتۆو"(حیوان منـوي)ێك بدەیت دەبینیت هەرگیز درۆ ناکات، چونکە بەپێی سیستەم و پلانێکی دیاری‌کراو دەجووڵێتەوە. خۆ ئەگەر بلێت: "دەبم بە مرۆڤ" ڕاست دەکات دەبێت بە مرۆڤ، چونکە ئەو گوفتارە لە خۆڕا و بە هەڕەمەکی نالێت، بەڵکو بە زمانی کرۆمۆسۆمەکان و ئەو کارمەندی‌یە دوور لە هەڵەیەی (DNA و RNA) دەیلێت کە خانەکان ئاراستە دەکەن بۆ پێکهێنانی دەمی مرۆڤ و لێوەکانی و چاوەکانی و لووت و گوێچکەی و سیما و ڕوخسار و هەموو شتێکی تری.

هەروەها دووری‌یەکانی ناو بۆشایی ئاسمانیش لە لای گەردوونناسە فیزیای‌یەکان ئاشکرایە و، لە هێزە موگناتیسی‌یەکان و مەوداکانیشیان لەو دووری‌یە ئەندازەیی‌یە فراوانەدا و لە توندیی هێزەکانی ناویشیان شارەزا و ئاگادارن. دۆزینەوەی "کۆمپیوتەر" گەلێ یارمەتیی مرۆڤی دا کە بزانێت هەموو بەدیهاتوویەك لەم گەردووونەدا لە سەرەتای دروست‌بوونیەوە بەپێی نەخشە و پلانێکی داڕێژراو ڕێك‌دەخرێت، ئەم نەخشە و پلانە لە هەموو شتێکی گەردووندا ڕەچاو کراوە، هەر لە گەردیلەکانەوە تا دەگاتە گەلەستێرەکان، چونکە هەموو شتێك لە "لەوحی مەحفووظ"دا تۆمار و دەست‌نیشان کراوە. ئەمەش بریتی‌یە لەوەی کە پێی دەڵێن: "قەدەر".

لەوانەیە باشتر وابێت ئەم مەسەلەیە پتر ڕوون بکەینەوە.

ئەوەی کە تا ئێستا باسمان کرد لە بارەی "قەدەری جەبری"یەوەیە، واتە ئەو قەدەرەی کە دەسەڵات و کاریگەریی مرۆڤی تێدا نی‌یە، ئەم قەدەرە شتێکی گەردوونی‌یە و

"ویستی مرۆڤ" ڕەچاو ناکات، بەڵکو خوای گەورە بە "ویست"ی خۆی هەرچی‌یەکی بوێت بەدیی‌دەهێنێت و هەر کارێکی بوێت دەیکات. لەسەر ئەو کارانەش کەس پرسیاری لێ ناکات، چونکە هەر خۆی قاهیر و جەبار و زاڵ و بەدەستەڵاتە. خۆ هەرچەند هەموو بەدیهاتوویەك حیکمەتی تێدا ڕەچاو کراوە، بەڵام ئەم حیکمەتە پابەند(موقەییەد) نی‌یە، چونکە خواوەند خۆی ﴿فَعَّالٌ لِما يُرِيدُ﴾ە. ئەوەتا گۆی زەوی لە سەرەتای دروست‌بوونیەوە و بە فەرمان و دانەبەری ئەم قەدەرە جەبری‌یە، بە دەوری خۆی‌دا دەخوولێتەوە و لە هەمان کاتیش‌دا بە دەوری خۆریش‌دا دەسووڕێت، بێ ئەوەی کەس مافی ئەوەی هەبێت پێی بلێت: ڕابووەستە و مەجوولێ .. هەروەها خۆر و مانگ لە پێشبڕکێ‌دان و کەس ناتوانێت ڕێ لەم پێشبڕکێ‌یەیان بگرێت، چونکە هەر تەنها قەدەری جەبری‌یە کە بەسەر ئەم بزووتن و پێشبڕکێ‌یەدا زاڵ و دەستەڵاتدارە. کەواتە هەموو شتێك بە ناچاری سەری بۆ ئەم قەدەرە نەوی کردووە.

### ٣- قەدەر مەسەلەیەکی "ویجدانی"یە.

دەتوانرێت بە چەندەها بەڵگەی زانستیی جۆراوجۆر "بوون"ی خوای گەورە و، پێغەمبەرێتیی حەزرەتی "محمد المصطفى" ﷺ، تەنانەت زیندووبوونەوەی پاش مردنیش بچەسپێنرێت، بەڵام "قەدەر" وانی‌یە؛ چونکە مەسەلەیەکی حاڵی و ویجدانی‌یە، نەك زانستی و نەزەری!

ئەوەتا مرۆڤ بە ئەندازەی پلەی ئیمانەکەی خۆی، ئیمانیش بە "قەدەر" دەهێنێت و بە ئەندازەی فراوانی و قووڵیی هەستە ئیمانی‌یەکانیشی تەسدیقی دەکات. زۆر کەس هەن کە ژیانیان لە چەندەها مەسەلە و بابەتی قووڵ‌دا بردووەتە سەر، کەچی هێشتا لە بچووکترین مەسەلەی قەدەر تێنەگەیشتوون. ئەوانە - بە ڕاستی - بێ‌بەختن، چونکە "قەدەر" هیچ جێگایەکی لە ناخی ویجدانی ئەواندا نەگرتووە، کەواتە شایانی بەزەیی‌پێداهاتنەوەن. بەڵام ئەو کەسەی کە بە ویستی خۆی ڕازی‌یە زیانی لێ بکەوێت، شایستەی ئەوە نی‌یە بە چاوی سۆز و بەزەیی‌یەوە سەیر بکرێت. ئەو جۆرە کەسانە کاروبارەکانی خوای گەورەیان بۆ ڕوون نەبووەتەوە کە لە پشت کاروبارەکانی خۆیانەوە دەست‌بەکارە، چونکە چاوەکانیان داخراوە و هیچ شتێك نابینێت، هەروەك ڕوانینیشیان هێندە کورت و کۆتایە کە ناگاتە حەقیقەتێکی مەزن کە بریتی‌یە لەوەی: هەر کردارێك دەکەن پێشتر بە تەقدیر و کارسازی‌یەکی زانستی‌یانە لە لایەن خوای گەورەوە نەخشە و پلانی بۆ دارێژراوە. جا ئەو جۆرە کەسانە بە شێوەیەکی سەرەتایی ژیانیان بەسەر دەبەن و، گەلێ دژوارە گرفتاری هەندێ لە چەمکە ئیعتیزالی‌یەکان نەبن.

## ٤- ئەو دەستکەوتەی کە "ئیمان بە قەدەر" بە مرۆڤی دەبەخشێت.

ئەو کەسەی بە تەواوەتی لە مەسەلەی قەدەر تێ گەیشتووە و لە ویجدانی خۆیدا نهێنییە تایبەتییەکانی قەدەری - بە وێنەی کردنەوەی گرێ - قۆناغ لە دوای قۆناغ شی کردووەتەوە.. ئەو کەسە لە کۆتاییدا هەموو شتێك بۆ خوای گەورە دەگێڕێتەوە، تا دەگاتە ئاستی ئەو تێگەیشتنەی کە ئەم ئایەتە پیرۆزە پێی دەبەخشێت:

﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ﴾(الصافات:٩٦).

بەڵێ، خوای گەورە بەدیهێنەری خۆمان و کردەوەکانمانە؛ خواردن و خواردنەوە و نوستن و بێداری و بیرکردنەوە و گوفتارمان، هەر هەموویان، بەدیهێنراوی خوای گەورەن. لە ڕاستیدا هەر شتێك پەیوەندیی بە "بەدیهێنان"ەوە ببێت، بەوپەڕی دڵنیایی و بێ گومانی، بەدیهاتووی خوای گەورەیە. ئەو کەسەی کە یەك بەیەکی نهێنییەکانی قەدەری شی کردووەتەوە و گەیشتووەتە کۆتایی، لە هەڵس و کەوتی ویجدانیی خۆیدا ئەم حەقیقەتە وەك خۆری ڕووناکی ناوجەرگەی ئاسمان بە ڕوونی دەبینێت. جا لەبەر ئەوەی ئەم ڕاستییە بەم جۆرەیە، ئەوا ئەو کەسەی لەم بوارەدا گەشتووەتە کۆتایی، گەلێ دژوارە کە دووچاری "جەبرییەت" نەبێت!

بەڵام دەبێ بزانیت کە هەرچەندە مرۆڤ هەموو کارەکان بۆ خوای گەورە بگێڕێتەوە، هەر لە ئەنجامدا "ویستە جوزئی"یەکەی خۆی لە بەردەمدا ڕاست دەبێتەوە و بەرپرسیارییەکەی ئەستۆی یاد دەخاتەوە! تاکو تێی بگەیەنێت کە بەرپرسیاری کردەوەکانیەتی و هەرگیز ئەم بەرپرسیارییەی لەسەر هەڵناگیرێت.. هەر لە هەمان کاتیشدا و بۆ ئەوەی مرۆڤ بەهۆی کردەوە چاکەکانیەوە لە خۆی بایی نەبێت، "قەدەر" ڕووبەڕووی دەبێتەوە و پێی دەڵێت: (لە خۆت بایی مەبە، چونکە تۆ "بکەر"ی ئەم کردەوە چاکانە نییت)! ئیتر لەم ڕێیەوە لە "غروور" و "لەخۆباییبوون" ڕزگاری دەکات. هەر تەنها بەم جۆرە مرۆڤ دەگاتە "هاوسەنگی" لەم مەسەلەیەدا و هەر تەنها بە پارێزگاری کردنیش لەم هاوسەنگییە دەتوانێت ژیان و ڕەفتارەکانی خۆی ڕێك بخات.

هەرچی کردەوەی چاك هەن هەر هەموویان تەنها "کار" و "تەقدیر"ی خوای گەورەن، کەواتە مرۆڤ ناتوانێت خۆی بکات بە خاوەنیان، دەنا گرفتاری شیرکی پەنهان دەبێت، چونکە هەر تەنها خوای گەورەیە کە ڕاستەوخۆ کردەوە چاکەکان بە مرۆڤ دەبەخشێت، نابینیت دەروونی بەدخوازی مرۆڤ(النفس الأمارة بالسوء) هەرگیز داوای کردەوەی چاك ناکات؟ ئاشکرایە کە مەبەست بە کردەوەی چاك لێرەدا ئەو کردەوانەن کە لە زاتی خۆیاندا چاك و جوانن، دەنا مەبەست ئەو شتانە نییە کە

ئارەزووی دەروونی بەدخواز بە جوانیان دەزانێت! بەڵێ، ڕقبوونەوە لە "جوانی"ی ڕاستەقینە لە سروشتی دەروونی بەدخوازدا ڕیشکی داکوتاوە و دوژمنایەتی کردنیشی بەرامبەر کردەوەی چاك هەروا بەردەوام دەبێت، چونکە لەسەر ئەو سروشتە بەدیهێنراوە.

"دەروونی بەدخواز" خۆی داوای کردەوە خراپەکان دەکات، بۆیە بەرپرسیاریی ئەو کردەوانەی دەکەوێتە ئەستۆ. ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە ئەم دوو بناغەیەی لە خۆدا کۆکردووەتەوە و بە جوانی ڕوونیان دەکاتەوە:

﴿مَا أَصَابَكَ مِن حَسَنَةٍ فَمِنَ اللهِ وَمَا أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَفْسِكَ﴾(النساء:٧٩).

لەبەر ئەوە، هەرگیز مافی ئەوەت نی‌یە بەو کردەوە چاکانە لە خۆت بایی ببیت کە ناگەڕێنەوە بۆ تۆ، چونکە ئەو کردەوە چاکانە ڕاستەوخۆ هی تۆ نین. خۆ هەرشتێك "باش و جوان" بێت تەنها چاکەکاریی خوای گەورەیە لەگەڵ تۆدا کردوویەتی، ئاشکرایشە چاکەکاریی خواوەند داخوازی شوکرانەبژێری و تەوازوعە، نەك لەخۆبایی‌بوون!

سەبارەت بە کردەوە خراپەکان و گوناهەکانیشت ئەوا "ویستە جوزئی"یەکەت مەرجێکی ئاسایی‌یە لە بەدیهێنانیاندا، بۆیە بەرپرسیاریی ئەو کردەوانە دەکەوێتە ئەستۆی نەفسەوە. چونکە تۆ بۆ خۆت ئارەزووت لە چ کردەوەیەك بووە و نەفسیشت مەیلی بەلادا ڕۆشتووە یان بیری لێ کردووەتەوە کە ئەنجامی بدات یاخود هەر هەڵسوکەوتێك لە مەیل و ئارەزووەکانتدا، خوای گەورە ئەوەی بەدی‌هێناوە.

ئەم جۆرە شتانە مەگەر لە ناخی خۆماندا و بە هەست‌پێکردنی "ویجدانی" و "حالی" واتە: بە کردەوە، دەنا ناتوانین لێیان تێبگەین. واتە تەنها یەك شایەت هەیە لەسەر ئەو مەیلەی کە بە دڵتدا هاتووە یاخود بەسەر ئەو هەڵسوکەوتەی لەو مەیلەدا ئەنجامت داوە، ئەویش "ویجدان"ی خۆتە. جا خوای گەورە ئەم ویجدانەی خۆتی کردووە بە شایەت لەسەر زانیاریی خۆی سەبارەت بە کردەوەکانت.

مرۆڤی سەرەتاییش لە بابەتەکانی ئیماندا، بە هەمان جۆر باوەڕی بە "قەدەر" هەیە، بەڵام بەو جۆرەی کە لە گۆشەی "قەدەر"ەوە دەڕوانێتە ڕووداوەکانی کاتی "ڕابوردوو" و ئەو "گیروگرفتانە"ش کە دێنە ڕێی، ئەوەتا دەڵێت: (ئەو بەڵا و موسیبەتانەی کە دووچاریان بووم تەقدیری خوای گەورەن). بەم جۆرە ڕزگاری دەبێت.. بەڵام کاتێ سەیری ئاینده و گوناهەکان دەکات لە گۆشەی "ویستی جوزئی"ی خۆیەوە بۆیان دەڕوانێت و دەڵێت: (هەرچۆن بووە خوای گەورە چیی بۆ تەقدیر کردووم، بەدەستی دەهێنم). بەم جۆرە، خۆی ناهاوێتە ناو باوەشی تەمبەڵی‌یەوە و

"قەدەر" ناكات بە بیانوویەك بۆ پاساودانی ئەو كردەوە خراپەی نییەتی لێ هێناوە بیكات. چونكە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وأنْ ليسَ لِلإنسَانِ إلاّ مَا سَعَى﴾(النجم:٣٩).

بەڵێ، خوای گەورە بەدیهێنەری هەموو چاكە و خراپەیەكە، چونكە "بەدیهێنان" تەنها تایبەتە بە خواوەندەوە، بەڵام بەرپرسیاریی كردەوەی خراپ لە ئەستۆی ئەو كەسەدایە كە "ویستوویەتی" بیكات. ئەو چەشنە ئیمانە، بناغەی ئیمانی مرۆڤی سەرەتاییە..

بەڵام دوای ئەمە، نابێت مرۆڤی سەرەتایی لەم ئەندازەیە زیاتر دەم لە مەسەلەی قەدەر بدات و مافی ئەوەی نییە قسە لە مەسەلە و بابەتە فەرعییەكانی بكات، چونكە قەدەر جێی پێهەڵخلیسكانە و بابەتێكی گەلێ وردە. ئیمامی ئەعزەم حەزرەتی ئەبوو حەنیفەی نوعمان - خوا لێی ڕازی بێت - ڕێی بە قوتابییەكانی خۆی نەدەدا كە لەم چەشنە بابەتانە بدوێن. كاتێ كە لێیان پرسی: ئەی خۆت بۆچی لێیان دەدوێیت؟ وەڵامی دانەوە: (كاتێ كە من قسەی تێدا دەكەم هێندە بە ترس و لەرزەوە دەدوێم دەڵێی باڵندە بەسەر سەرمەوە نیشتووەتەوە). مەبەستی ئەوەیە كە: ئێوە كاتێ لە قەدەر دەدوێن نیازتان سەركەوتنە بەسەر بەرامبەرەكەتاندا، بۆیە ڕێتان پێ نادەم قسەی تێدا بكەن. دەبێ ئەوەش بزانرێت كە وردیی لەڕادەبەدەری ئەم بابەتە و مەترسیی لێدوانی، هەرگیز خاوێنیی مەنتیقییەتی مەسەلە باسكراوەكە لێڵ ناكات، چونكە مەبەست ئەوەیە كە نابێ ئەم چەشنە بابەتانە، بە تایبەت مەسەلەی قەدەر، هەروا بە هەڕەمەكی باس بكرێن، بەڵكو دەبێ كەسێك قسەیان تێدا بكات كە بە وێنەی شارەزایی مرۆڤی كیمیاگەر و كارامەیی زەڕەنگەر، لەو مەسەلە و بابەتانەدا كارامە و شارەزا بێت.

### ٥ - "قەدەر" و "ویستی جوزئی" دژایەتییان لە نێواندا نییە.

"قەدەر" و "ویستی مرۆڤ" لە بناغەدا نەك هەر پێچەوانەی یەكتر نین، بەڵكو شانبەشانی یەكتریشن. خۆ ئەگەر ڕۆشتنی مرۆڤ بە كردەوە چاكەكانی بۆ ناو بەهەشت و بە كردەوە خراپەكانیشی بۆ ناو دۆزەخ بە "مەسەلە"یەك دابنرێت، ئەوا مەسەلەكە ئەوە دەگەیەنێت كە خواوەندی پەروەردگاری هەموو جیهانەكان بە زمانی "قەدەر" تەسدیقی دەكات، هەروەك لە لایەكی تریشەوە پشتگیریی خواوەند دەگەیەنێت بۆ "ویستی مرۆڤ"..

بەو واتایەی كە مرۆڤ هێزێكی تێدایە هانی دەدات بۆ كردەوە باش و جوانەكان و پاشان بۆ چوونە بەهەشت. هەروەها بە پێچەوانەشەوە، واتە هێزێكی ئەوتۆشی تێدایە كە بەرەو كردەوە خراپەكان و گوناهباری دەیداتە بەر و لە ئەنجامدا دەیخاتە ناو دۆزەخ. جا ئەم "هێز"ە بناغەی "تەقدیر" پێك دەهێنێت كە ئەویش جگە لە "ویستی مرۆڤ" هیچ

شتێکی تر نی‌یە. خۆ بوونی ئەم "ویست"ەش نە پێچەوانەی تەقدیری خواوەندە و نە ڕێشی لێ دەگرێت.

لە ڕاستی‌دا دەتوانین سەبارەت بە هەموو کردەوەکانمان بەم جۆرە بیر بکەینەوە. بۆ نموونە: گەر بمانەوێت دەستمان بەرز بکەینەوە ئەوا دەتوانین بەرزی بکەینەوە گەر هیچ ڕێگرێك لە گۆڕێ دا نەبێت.. هەروەها دەشتوانین بدوێین گەر بمانەوێت. واتە ئەنجامدانی کردەوەکانمان دەیچەسپێنێت کە ئێمە "ویست"ێکمان هەیە. گەر بتەوێت دەتوانیت ناوی: "جوزئی ئیختیاری" یان "ئارەزوو" یان "خواست"ی لێ بنێیت، ئەنجام هەر یەکێکە با ناوەکانیشی جیا بن، چونکە ئەو "ویست"ەی کە ماهییەتەکەشی نازانین چی‌یە، بە وێنەی خۆری ئاسمان، ڕوون و هەست‌پێ کراوە.

بەڵێ، گەر لە ڕووی "تەقدیری خواوەند"ەوە بڕوانینە مەسەلەکە، دەبینین وەك ئەوە وایە کە خوای گەورە بە مرۆڤ بڵێت: (من دەزانم کە تۆ لە فلان کات‌دا ویستی خۆت لەو کارە دیاری کراوەدا دەخەیتە کار، بۆیە ئەو کارەت بەو شکڵ و شێوەیە بۆ تەقدیر دەکەم). ئەمەش لە ناوەڕۆك‌دا پشتگیریی "قەدەری خواوەند"ە بۆ "ویستی مرۆڤ"!

بەڵێ، خوای گەورە هەر خۆی بەدیهێنەری هەموو شتێکە. جا مادەم بە هەموو شتێك ئاگادارە ئەوا "تەقدیر"ی خۆی بۆ ئەو شوێنە ئاراستە دەکات کە مرۆڤ ویستی خۆی بۆ ئاراستە کردووە. واتە "قەدەر" پشتی "ویستی مرۆڤ" دەگرێت و بەتاڵی ناکاتەوە. بە واتایەکی تر دەورانەوری "ویست"ی مرۆڤی داوە و پشتی دەگرێت و هەرگیز پێچەوانەی نی‌یە.

### ٦ - "قەدەر" جۆرێکە لە "زانستی خوایی".

قەدەر بریتی‌یە لەو نەخشە و پلان و ڕێکخستنەی کە خوای گەورە لە زانستی خۆی‌دا بۆ هەموو شتێکی دارشتووە. خۆ ئاشکرایشە کە هەر شتێك زانرا، ئەوە ناگەیەنێت کە تەنها بەو زانینە هاتووەتە وجوود و بەدی‌هێنراوە. چونکە گەر نەخشەی هەزار خانووبەرە بزانیت و پلانی کاری سەدان کارگە لەبەر بکەیت، ئەوا هەرگیز بەم زانینەت و بەم نەخشە و پلانەی کە لە زەینی تۆدا هەن، هیچ شتێك نایەتە وجوود. چونکە دروست کردنی ئەو خانووبەرە و کارگانە پێویستیان بە: "ویست" و "توانست" هەیە. دەنا بە پێچەوانەی ئەمەوە، گشت ئەو پلان و نەخشە جۆراوجۆرانە تەنها چەند زانیاری‌یەك دەبن کە تایبەتن بە خۆتەوە و، بە ئەندێشەی خۆت بەناویان‌دا دەگەڕێیت و، هەر ڕێگرێك ڕێ لە ئەندێشەت بگرێت، بە هۆیەوە هەموو ئەو خانووبەرە و کارانەش تیا دەچن، تەنانەت گەر هێزی ئەندێشەت لە کار بکەوێت ئەوا وەك ئەوە وایە کە هەر هیچ زانست و نەخشە و پلانێك ڕووی نەدابێت!

هەروەها ئەوەش دەخەینە ڕوو کە "قەدەر" لە جۆری "زانستی خوای گەورە"یە. خۆ هەمیشە "زانین شوێنکەوتەی زانراوە". واتە "زانراو" لەسەر هەر چۆنێتی‌یەك بێت بەو چۆنێتی‌یە "زانین" دەورەی دەدات و پەیوەندیی پێوە دەکات. نەك بە پێچەوانەوە "زانراو" شوێنکەوتەی "زانست" بێت!

جا مادەم ئەمە وایە، ئەوا خوای گەورە هەموو ئەو کردارانە و چۆنێتی‌یەکانیشیان "دەزانێت" کە ئێمە بە "ویست"ی خۆمان ئەنجامیان دەدەین و، "تەقدیر"ەکەشی بەپێی ئەو زانینە دادەنێت. چونکە زانستی خوای گەورە هەمەلایەنگیرە و دەوراندەوری هەموو شتێکی داوە. تەنانەت دەستەواژەی: (ئەم شتە دەگەڕێتەوە بۆ زانستی خوا) بێ ئەدەبی‌یە بەرامبەر بە خوای گەورە! چونکە هیچ شتێك نی‌یە لە زانستی خواوەند بەدەر بێت. کەواتە تەنها بۆ نزیكخستنەوەی ئەم مەسەلەیە لە ژێری‌یەوە و بە مەبەستی تێگەیاندن دەتوانین ئەم دەستەواژەیە بەکار بهێنین.

با - بۆ نموونە - بیر لە شەمەندەفەرێك بکەینەوە کە ماوەی نێوان دوو وێستگای دەستنیشان کراو بە کاتێکی زانراو دەبڕێت. ئەم ئەنجامە زۆر لە پێش کەوتنەڕێی شەمەندەفەرەکە حساب کراوە و زانراوە، ئەو زانیاری‌یانەش هەندێ جار لە چەند لیستە و تۆمارێك‌دا چاپ دەکرێن. جا ئەم ئەنجامە "زانراو"ە بریتی‌یە لە: نەخشە و پلان. خۆ ئەگەر ئەم نموونەیە بۆ سەر مەسەلەکەی خۆمان قیاس بکەین، دەڵێین: ئەم ئەنجامە بریتی‌یە لە قەدەر، یاخود "قەدەر" ئەم ئەنجامەیە. بەڵام دەبێ بزانین کە ئەم "زانیاری"یانەی پێشتر مان هەرگیز هێزێکی جەبری نین شەمەندەفەرەکە بخەنە گەڕ و بیجووڵێنن. بەو واتایەی هۆی ڕۆشتنی شەمەندەفەرەکە بەرەو وێستگا دیاری کراوەکە ئەوە نی‌یە کە ئەم نەخشە و پلانە وا داڕێژراوە! بەڵکو بە پێچەوانەوە: لەبەر ئەوەی شەمەندەفەرەکە لەو کاتانەدا دەگاتە ئەو وێستگایانەی کە لەم نەخشە و پلانەدا - واتە لە قەدەری شەمەندەفەرەکەدا - ناویان هەیە، ئەوا بەو جۆرە لە نەخشە و پلانەکان‌دا ماوەی گەیشتنی بۆ ئەو وێستگایانە تۆمار کراوە، چونکە "زانین شوێنکەوتەی زانراوە" کەواتە هەر شتێك لە سەر هەر چۆنێتی‌یەك بێت بەو جۆرە "دەزانرێت" و هەر بەو پێ‌یەش تەقدیری بۆ دادەنرێت.

ئەوەندە هەیە دەبێ بزانین کە "زانین"ی خوای گەورە لە بەرزایی‌یەوە و لە یەك کات‌دا دەڕوانێتە هەموو ئەو شتانەی کە ڕوویانداوە و ئەوانەش کە ڕوو دەدەن، وەك ئەوەی کە بڕوانێتە یەك خاڵ. کەواتە هۆکار و ئەنجام.. عیللەت و مەعلوول.. سەرەتا و کۆتایی، هەموویان لە یەك خاڵی زانستی ئەودان، بۆیە لە زانستی خوادا: سەرەتا و

کۆتایی.. پاش و پێش.. نیی‌یە. واتە زانستی خوای گەورە دەوراندەوری هەموو شتێکی داوە، لە هەموو لایەکی ئەو شتەوە.

جا خوای گەورە "تەقدیری خۆی" بەپێی ئەم "زانست"ە هەمەلایەنگرە دادەڕێژێت. لەبەر ئەوە، ئەم تەقدیر و دەستنیشانکاری‌یەی خواوەند حسابی بۆ "ویستی مرۆڤ" کردووە لەو کردارانەی‌دا کە مرۆڤ بە ویستی خۆی ئەنجامیان دەدات. واتە "تەقدیر"ی خوای گەورە "ویستی مرۆڤ" لە حسابی خۆی دەرناکات و بەتاڵی ناکاتەوە.

کردارەکانی مرۆڤ هەر هەموویان پێشتر لە "لەوحی مەحفووظ"دا تۆمار کراون. ئنجا دوای ئەوە هەر شتێکی بۆ تەقدیر کراوە و بە ئەستۆی‌دا هەڵواسراوە بریتی‌یە لەو کردارانەی کە لەبەر ئەم لەوحی مەحفووظەدا گیراونەتەوە و نووسراونەتەوە، وەك بە ڕوونی لەم ئایەتە پیرۆزەوە دەردەکەوێت:

﴿وَكُلَّ إِنْسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا يَلْقَاهُ مَنْشُورًا﴾(الإسراء:١٣).

بەڵێ، هەر کردارێك کە مرۆڤ دەیکات، پێشتر نووسراوە. ئەوەندە هەیە مرۆڤ بە کردەوەکانی ئەو شتانە دەخاتە دۆخی جێ‌بەجێ کردنەوە کە لە بارەیەوە نووسراون. ئەم قەدەرە نووسراوەش بریتی‌یە لەو زانستەی خوای گەورە کە پێشتر زانیویەتی ئەم مرۆڤە چ کردەوەیەك دەکات. دیارە ئەم زانینەش هێزێك نیی‌یە کە مرۆڤ ناچاری ئەنجامدانی کردەوەکان بکات. خۆ ئەگەر بەراوردێك بکرێت لە نێوان ئەو نووسراوەی کە بە ئەستۆی مرۆڤدا هەڵواسراوە و ئەو نووسینەش کە مەلائیکەتان کردەوەکانی مرۆڤی پێ تۆمار دەکەن، دەردەکەوێت کە مرۆڤ سەرجەمی ئەو کردەوانەی ئەنجام داوە کە لە نووسینی یەکەم‌دا تۆمار کرابوون. جا خوای گەرەش ئەم کتێبە نووسراوە بە مرۆڤ دەخوێنێتەوە و بەپێی ئەوە لێپرسینەوەی لەگەڵ‌دا دەکات.

بەم بۆنەیەوە دەمەوێت ئاماژە بۆ ئەمەی خوارەوە بکەم:

ئەوانەی کە بە "جیددی" مامەڵە لەگەڵ مەسەلەکانی "ڕۆح"دا دەکەن، دەڵێن: ڕۆح هاوڕێی جەستەیە. بەو واتایەی کە هاودەم لەگەڵ جەستەی میسالی‌دا ڕوویەکی تر لە مرۆڤ‌دا هەیە تایبەتە بەو تەقدیر و دەستنیشانکردنانەی کە تایبەتن بە ژیانیەوە. کەواتە هەرکات توانرا ماهییەت و ئەرکی ڕۆح بە تەواوەتی بزانرێت، ئەوا دەشتوانرێت - تا ڕادەیەك - ئەو شتانە بزانرێن کە بۆی تەقدیر کراون.

ئنجا ئەوانەش کە بە "عیلمی قیافەت"ەوە سەرقاڵن - واتە ئەو ناوەڕۆکانەی کە لە پشت لایەنی ماددیی مرۆڤەوەن، وەك هێڵەکانی ناولەپی دەستی - دەڵێن: ئەم جۆرە شتانە بریتین لە شکانەوە(إنعكاسات)ی قەدەر بەسەر جەستەی مرۆڤەوە. واتە دەتوانن -

تا ڕادەیەك – با ئەو ڕادەیە "جوزئی"ش بێت ئیددیعای ئەو ڕووداوانە بکەن کە دێنە ڕێی مرۆڤ. تەنانەت ئەوانەی کە بەسیرەتێکی تیژ و فیراسەتێکی بەهێزیان پێ دراوە، هەر تەنها بەوەی کە سەیری سیما و ڕوخساری مرۆڤ بکەن، دەتوانن پەی بە هەندێ موقەددەراتی مرۆڤ ببەن. ئەم جۆرە زانینانەش هەرگیز بە زانینی "غەیب" دانانرێت، چونکە هەموو ئەو جۆرە کەسانە لەو باوەڕەدان کە سەرجەمی نهێنییەکانی قەدەر لە شێوەی چەند نیشانە و ئاماژەیەك لە جەستەی مرۆڤدا دانراون، چونکە "غەیب" بە واتا ڕاستەقینەکەی خۆی هەرگیز بەم چەشنە مەعلووماتانەوە نابەسترێتەوە. بەو واتایەی کە ئەو شتانەی باسمان کردن هەرگیز پێچەوانەی دەستووری "لا يعلم الغيب إلا الله" نین. چونکە هەوڵدانی زانینی قەدەری مرۆڤ لە ڕێی ئاماژە و نیشانەکانی جەستەیەوە زانستێك بووە تەنانەت لە سەردەمی پێغەمبەریشدا ﷺ برەوی بووە و ئەو کەسەی شارەزای ئەم زانستە بووە پێی وتراوە "قائف". بە ڕادەیەك کە پێغەمبەریش ﷺ ئینکاریی ئەم زانینەی نەکردووە، تەنانەت هەر بۆ خۆی "قائیف"ێکی هێنا و ئنجا "ئوسامە" و باوکی کە ناوی "زەیدی کوڕی حاریثە" بوو بە ڕاکشاوی پیشانی ئەو قائیفەی دان دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ هەردووکیانی داپۆشی و تەنها پێیان بەدەرەوە بوو. لەبەر ئەوەی ئوسامە وەك باوکی سپی پێست نەبوو، خەڵکیش موناقەشەیان لەم جیاوازییەدا دەکرد:

"عوروە" لە حەزرەتی عائیشەوە – خوایان لێ ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: جارێکیان پێغەمبەر ﷺ خۆی ئامادە بوو کە قائیفێك هاتەماڵەکەمان و ئوسامەی کوڕی زەید و زەیدی کوڕی حاریثە ڕاکشابوون. قائیفەکە وتی: ئەم پێیانە لەیەکترن. پێغەمبەریش ﷺ زۆر دڵخۆش بوو بەمە و سەری لێ سووڕما و ئەم هەواڵەشی بە عائیشە دا[1].

## ٧ – ئەرکی سەرشانی "ویست"ی مرۆڤ.

ئێمە وا ناڕوانینە "ویست"ی مرۆڤ کە خاوەنی "بوون"(وجود) بێت. ئەمەش بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە کە نوێنەری بیروباوەڕی زۆربەی نەتەوەی ئیسلامە.

ئێمە باوەڕمان وایە کە: هەموو ئەندامێکی جەستەمان لە ڕاستیدا هەیە و خاوەنی "بوون"ە و خوای گەورەی بەدیهێنەر بەدیی هێناوە. بۆنموونە: من "سەر"م هەیە، کەواتە دارای وجوودە و لە لایەن خوای گەورەوە بەدیهێنراوە.. هەروەها "لووت"م هەیە و

(١) البخاري، فضائل أصحاب النبي، ١٧.

ئەویش لە لایەن خواوەندەوە بەدیهێنراوە.. بە هەمان جۆر "دەست"م هەیە.. دوو "چاو"م هەیە.. بە هەمان جۆر هەموو ئەندامەکانی جەستەم دارای وجوودن و لە لایەن خوای گەورەوە بەدیهێنراون.

بەلام ناتوانین بەو جۆرە لە "ویست" بدوێین. بەڵێ، ڕاستە ئێمە خاوەنی "ویست"ێکین، بەلام ئەم ویستە "وجوودی خارجی"ی نییە. کەواتە بەدیهاتووش نییە، هەر لەبەر ئەوەشە کە ناتوانین ویستی خۆمان وەك شتێکی خاوەن وجوود ببینین..

چونکە ئەو شتانەی کە "نەبوو" (واتە: نامەوجوود)ن ئەوانەن کە بەدینەهێنراون بەلام لە "زانین"ی خوای گەورەدا "زانراو"ن، واتە تەنها وجوودی عیلمییان هەیە، ئەوەندە هەیە ویست و توانستی خواوەند پەیوەندییان پێوە نەکردووە (تا وجوودی دەرەکیشیان ببێت).

خۆ ئەگەر لە ڕاستیدا ئەمە بە پێچەوانەوە بوایە، واتە ویستی مرۆڤ کتومت وەك ئەندامەکانی جەستەمان خاوەنی "بوونی دەرەکی" بوایە، ئەوا ئەم کارە سەری لە "جەبر"ەوە دەردەچوو. واتە ئەگەر ویستی ئێمە بە وێنەی ئەندامەکانمان بەدیهاتوو بوایە و خواوەند لە بەدیهێنانیدا پرس و ڕای پێ نەکردینایە و سەربەستیی تێدا پێ نەبەخشینایە، ئەوا هیچ کردارێکی مرۆڤ بەرپرسیارێتی ڕووی تێ نەدەکرد و کەسیش مافی داواکردنی پاداشتی نەدەبوو لەسەر کردەوە چاکەکانی، چونکە بە ناچارەکی کردوونی و لە هەڵبژاردنی کردەوەی چاك یان خراپدا سەربەست نەدەبوو. کەچی کاتێ لە ویستی خۆمان ورد دەبینەوە، دەزانین وا نییە.

کەواتە "ویستی مرۆڤ" خۆی لە خۆیدا بەدیهێنراو نییە و بوونی دەرەکیی نەدراوەتێ، بەڵکو بوونێکی گوێرەیی(وجود إعتباري)ی پێ دراوە، بە وێنەی هێڵەکانی زانستی "ئەندازیاری" کە تەنها خاوەنی بوونێکی گوێرەیی و گریمان کراون. واتە ویستی مرۆڤ و جوزئە ئیختیارییەکەی خاوەنی وجوودێکی گوێرەیی گریمان کراون، خۆ ئەم چەشنە وجوودەش هەرگیز ناتوانرێت بە هیچ پێوەر و کێشانەیەك پێوانە بکرێت.

بەم جۆرە دەرکەوت کە: "ویستی مرۆڤ" خاوەنی بوونێکی گوێرەیی بێ کێش و قورساییە، کەچی مەرجێکی عادەتییە بۆ کاروبارەکانی خواوەند و بەدیهێنانی شتان لە لایەن خوای گەورەوە. واتە هەرکات مرۆڤ لە سنووری ویستی خۆیدا ئەو کارەی ڕاپەڕاند کە تایبەتە بە خۆیەوە - ئیتر ئەو کارە چ بریتی بێت لە "مەیل" یان "هەڵس و کەوت لەو مەیلەدا"[1] - ئەوا خوای گەورە ئەو کارە بەدیدەهێنێت کە

(١) لە پەیامی "قەدەر"ی مامۆستا نوورسیدا ئەم باسە بە پوختی هێنراوە. (وەرگێڕ)

مرۆڤەکە "ویستوویەتی". ئا لێرەوەیە کە "ویستی مرۆڤ" گرنگی‌یەکی مەزنی بەدەست هێناوە، چونکە کاری بەدیهێنان - کە هی خوای گەورەیە - بەم "مەیل"ە یان بەم "هەڵس‌وکەوت کردنە لەو مەیلەدا" بەستراوەتەوە، هەرچەندەش ئەم مەیل و هەڵس‌وکەوتە بۆ خۆیان خاوەنی "بوونی دەرەکی" نین.

با نموونەیەك بۆ ئەمە بهێنینەوە:

ئەو نەخشە و پلانی بیناسازی‌یەی کە لە بەردەستماندایە، هەرگیز کار ناکاتە سەر دروستکردنی ئەو بینایە. خۆ ئەگەر ئێوە بە ڕۆژ و بە شەو ئەم نەخشەیە هەڵبگرن و لە بەرچاوتاندا دایبنێن، هەرگیز کاری بنیاتنانەکە ڕاناپەڕێنێت، واتە لەم لایەنەوە ئەو نەخشە و تەصمیمە هیچ نرخ و گرنگی‌یەکیان نی‌یە. بەڵام هەر ئەوەندەی دەستتان دایە کاری بنیاتنان یەکسەر نەخشە و تەصمیمەکە گرنگی بەدەست دەهێنن، چونکە کاری بیناسازی‌یەکە بە بێ بوونی ئەو نەخشەیە بەڕێ ناکرێت!

ویستی مرۆڤیش وەکو ئەم نەخشەی بیناسازی‌یە وایە، چونکە لە ڕاستی‌دا بریتی‌یە لە چەند هێڵێکی گریمان کراو. ئەو شتەش کە ئێمە ناوی: "جوزئی ئیختیاری" یان "ئیرادەی جوزئی"مان لێ ناوە، لە ڕاستی‌دا بریتی‌یە لەم نەخشە و هێڵە گریمان کراوانە. بەڵام هاتنەدی و بەرجەستەبوونی ئەم نەخشەیە - واتە بەدیهێنانەکەی - تەنها بە دەستی خوای گەورەیە، واتە ئەو بەدیی‌دەهێنێت. بەو واتایەی بەدیهێنانی کارەکە لە لایەن خواوەندەوە بەپێی ئەو نەخشەیە ئەنجام دەدرێت. لە ڕاستیش‌دا "بەرپرسیارێتیی مرۆڤ لە کردەوەکانی" لەم ئەرك و کارمەندی‌یەی "ویستی مرۆڤ"ەوە سەرچاوە دەگرێت.

خۆ هەرچەندە ویستی ئێمە نرخ و گرنگی‌یەکی ئەوتۆی نی‌یە، کەچی خوای گەورە کارەکانمان بەپێی نەخشەی، ئەو ویستەمان بۆ بەدی‌دەهێنێت. هەر لەبەر ئەوەشە ئێمە "هۆکارێتی"ی خۆمان بەو شتە دەبەخشین کە لە لایەن خواوەندەوە بەدی‌دەهێنرێت. ئەوەتا پاداشتی ئەو کردەوە چاکانە دەدرێینەوە کە ئێمە بووین بە "هۆکار"ی بەدیهێنانیان، هەروەك سزاش دەدرێین لەسەر ئەو کردەوە خراپانەی کە ئێمە بووین بە "هۆکار"ی بەدیهێنانیان. ئا لێرەوەیە کە گەلێ ئەنجامی مەزن و گرنگ دەدرێنە پاڵ ئەم "ویست"ەی کە خۆی لە خۆی‌دا شتێکی نەزەری و گریمان کراوە و تەنها مەرجێکی عادی‌یە بۆ بەدیهێنانی شتان. کەواتە هەرگیز بە چەشنێکی ڕەها و موتلەق "جەبر" لە گۆڕێ‌دا نی‌یە. چونکە بەدیهێنەر هەر تەنها خوای گەورەیە، بەڵام ویستی مرۆڤی کردووە بە مەرجێك بۆ ئەو بەدیهێنانە. لەبەر ئەوە، دەبێ مرۆڤ بە وردی بیر لەم خاڵە بکاتەوە و، هاوسەنگیی نێوان "قەدەری خوا" و "ویستی مرۆڤ" لە پێش‌چاودا ڕابگرێت.

لە ڕاستی‌دا ئێمە لێرەدا یەکێك لە مەسەلە ئالۆزەکانی قەدەرمان خستووەتە ڕوو، کەواتە با هەوڵ بدەین بە چەند نموونەیەك ئەم بابەتە ڕوون بکەینەوە:

وا دابنێ ئێوە پەنجەتان دا لە سویچی مەکینەیەکی گەورەی کارەبا، لە کاتێك‌دا کە دەزانن کەسانێکی تری غەیری ئێوە ئەم مەکینەیەی بە سیستەمێکی هێندە ورد ئامادە کردووە کە هەر تەنها بە دەست‌لێدانی ئێوە هەموو دەوروبەر ڕووناك دەکاتەوە. جا ئەم کارە جوزئی‌یەی ئێوە و ئەو ئەنجامە مەزنەش کە لەو کارە جوزئی‌یەوە دەرکەوت، بە ڕوالەت هیچ پەیوەندی‌یەکی ئەوتۆیان لە نێوان‌دا نی‌یە کە ژێری پەسەندی بکات. واتە هیچ پەیوەندی‌یەکی وا لە نێوان "هۆکار" و "ئەنجام"دا نی‌یە کە بە لای عەقڵەوە پەسەند بێت، بە وێنەی موعجیزاتی پێغەمبەران، دروودیان لەسەر بێت.

دەتوانین ئەمە بەو شتانە قیاس بکەین کە پەیوەندی‌یان بە جیهانی ماددیی ئێمەوە هەیە. بۆ نموونە: سەیری ئەو پارووە بکە کە دەیخەیتە ناو دەمتەوە، پاشان بۆ ئەنجامەکانی بڕوانە لە جەستەی خۆت‌دا..

ئێوە دەڵێن: (خۆراکمان خوارد). بەڵام من دەڵێم: (نەخێر نەمان خوارد، بەڵکو خوای گەورە دەرخواردی داین). لەوانەشە هەر لە ڕووی ڕێزەوە قسەکەی من پەسەند بکەن. بەڵام گەر ئێمە بە وردی لە مەسەلەکە بکۆڵینەوە دەبینین قسەکەی من ڕاستە..

ئایا چۆن؟.. با بزانین:

ئێمە پارووەکە لە دەممان نزیك دەخەینەوە. دەبا بزانین کێ ئەم پارووەی بە ئێمە بەخشی؟ ئەو قۆناغانەی کە ئەم پارووە بڕیونی چین، تا وای لێ هاتووە بۆ خواردن بشێت؟ چۆن خۆر بووە بە کولێنەر و پێگەیەنەری؟ ئەو هەل و مەرجانە چین کە وای لە زەوی کرد بەم جۆرە بیهێنێتە دەرەوە؟ بە ئاو و هەوای کێ هەناسەدانتان بۆ مسۆگەر کرد؟... هتد.

پاشان هەر ئەوەندەی پارووەکە بەر دەمتان دەکەوێت یەکسەر کارەکانی ئەوێ دەست پێ دەکات، لە کاتێك‌دا کە ئێوە هیچ زانیاری و ئاگا و خەبەرێکتان لەو کارلێکانەی دوای ئەوە نی‌یە. خۆ ئەگەر بتانەوێت ئەو کارلێکانە خۆتان ئەنجامی بدەن و ئەو خواردەمەنی‌یە بە ویستی خۆتان ئامادە بکەن، ئەوا لەوانەیە گەلێ کاری گەورە و کارلێکی گرنگتان لە بیر بچێت.. لەوانەیە زمانی خۆتان بگەزن.. لەوانەیە خواردنێکی ئامادەنەبوو بەرەو گەدە و لەوێشەوە بەرەو ڕیخۆڵەکان ڕەوانە بکەن. کەچی ئەم پارووە خواردنە هەر ئەوەندەی دەگاتە ناو دەم، تەنانەت کە هێشتا نەگەیشتووەتە ئەوێش، یەکسەر لیکەلوو(غـــدة)ەکان لیك دەردەدەن و ئەم ڕژێنە لیکانەش گەلێ کارلێکی گرنگ ئەنجام دەدەن کە بەپێی جۆری خواردنەکە ئەوانیش جیاجیان، چونکە

لیکەلووەکان بەپێی جۆر و چۆنێتیی خواردنەکە ئەم ڕژێنانە دەردەدەن. بێ گومان کاری گەدە لەمەش ئاڵۆزترە. ئەوەتا بە تەواوترین شێوە، کاری خۆی ڕادەپەڕێنێت و پاشان دوازدەگرێ و گلاندەکانی پەنکریاس و جگەر کاری خۆیان دەگرنە ئەستۆ و، بەم چەشنە هەریەکەیان ئیشەکەی خۆی جێبەجێ دەکات. تەنانەت جگەر هەر بە تەنها خۆی نزیکەی سێ سەد ئەرك ڕادەپەڕێنێت! بەم جۆرە هەموو یەکێك لەوانە، بە بێدەنگی و بێ هیچ قرە و غەڵبەغەڵبێك، کاری سەرشانی جێبەجێ دەکات، بە ڕادەیەك کە خۆیشمان هەست بەو کارانە ناکەین و ئاگامان لێ یان نییە.. ئنجا ڕیخۆڵەکان کاری خۆیان دەگرنە ئەستۆ و بە جوانترین شێوە جێبەجێی دەکەن، چونکە کاری هەرس و هەڵمژین دەگرنە ئەستۆ لە ڕێی ئەو مژۆڵانەی کە خۆراکی هەرسکراو بۆ ناو خوێن دەگوێزنەوە، شان بە شانی ئەمەش مادده زیانبەخشەکان جیا دەکەنەوە و فڕێیان دەدەنە دەرەوە، کە ئەمەش لەو گورچیلەیەدا بەڕێ دەکرێت کە لە نێوان حەوانەوە و کارکردندا ئیشی بە نۆرەی تێدا بەڕێوە دەچێت، چونکە نیوەی کرێکارەکانی وەك سپێر(إحتياط) دادەنێت و نیوەکەی تریشی لە کارێکی سەرومڕدان.

وا ئێستا پارووەکەمان خستە ناو دەممان، دەبینین هەر کارلێکێکی - هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی - بەسەردا دێت هیچ دەستتێوەردانێکی ئێمەی تێدا نییە، تەنانەت گەر بە تەواویش ئەو کارلێکانە بزانین. دیارە هەر تەنها خوای گەورەیە کە بەدیهێنەری هەموو ئەو کارانەیە.

لەبەر ئەوە، پرسیارەکەمان دووپات دەکەینەوە و دەڵێین: ئەم دوانە کامیان ڕاستە: (خواردنەکەم خوارد) یان (خوای گەورە دەرخواردی دام)؟! ئەوەندە هەیە ئێمە لە گوفتارەکانماندا ڕێگای "مەجاز" دەگرینەبەر و دەڵێین: خواردنەکەمان خوارد. دەنا گەر ئەم وشەیە بە واتا "حەقیقی"یەکەی خۆی بەکار بهێنین دەبێ بڵێین: خوای گەورە دەرخواردی داین.

بەم جۆرە گەر بێت و لەم گۆشەیەوە بڕوانینە مەسەلەکەمان، دەبینین جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان ئەم مەسەلەیە و ئەو کارانەماندا نییە کە بە ویستی خۆمان ئەنجامیان دەدەین. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ئەم مەسەلەیەمان لە ڕوویەکەوە شوبهاند بە "موعجیزە"، چونکە بواری لەیەکچوونی هەردوو مەسەلەکە نەبوونی پەیوەندییەکی وەهایە کە "ژیری" پێی قبووڵ بێت لە نێوان "هۆکار" و "بەهۆکراو"دا. واتە "تەناسوبی عیللییەت" بۆ هیچ کامیان لە گۆڕێدا نییە. وا تەشبیهی ئەم مەسەلەیە بەمەی خوارەوە دەکەین: گریمان مێروولەیەکی بچووك لە تەنیشتی کۆشکێکی مەزندا ببینرێت و، یەکێکیش بڵێت: ئەم کۆشکە مەزنە ئەم مێروولەیە بنیاتی ناوە! دیارە ناگونجێ باوەڕ بەم

گوفتارە بکرێت، چونکە یاسای "تەناسوبی عیللییەت"ی تێدا نەهاتووەتەدی. جا ئەو موعجیزانەی کە پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - پێش‌چاویان خستوون هەموویان لەم جۆرەن، بۆیە دەبن بە بەڵگە لە سەر پێغەمبەرێتیی ئەوان. واتە دەزانین کە هەرگیز ناگونجێ ئەم کارە دەراسایانە لەسەر دەستی مرۆڤ ڕوو بدەن، بۆیە ناچارین بڵێین - کە لە ڕاستیش‌دا هەر وەهایە -: ئەم موعجیزانە لە لایەن خواوەندەوە بەو پێغەمبەرانە بەخشراون. جا بەم پێیە هەموو ئەو کردارانەشمان کە لەسەر هێڵە گریمانکراوەکەی ویستی جوزئیمان بنیات‌نراون، وەك ئەمەی پێشوو وان.

بۆ نموونە: بە ئاماژەکردنی پەنجەی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ "مانگ لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بوو بە دوو لەتەوە و پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بڕوانن"[1]. هەروەك دەبینین پەنجەکانی هەمان دەستی پیرۆز، دەبێت بە دە کانیاوی ئەوتۆ کە بە خوڕ ئاویان لێ هەڵدەقوڵێت: "ئەنەس - خوای لێ ڕازی بێت - دەفەرموێ: بە چاوی خۆم بۆ ئەو ئاوەم دەڕوانی کە لە نێوان پەنجەکانیەوە هەڵدەقوڵا"[2].

جا هەروەك ناتوانین ئەم ئەنجامانە بۆ ئەو شتانە بگێڕینەوە کە لە ڕووی ڕواڵەتەوە بە "هۆکار" دادەنرێن، بە هەمان جۆر ناشتوانرێت هەموو کردارەکانمان، کە لەسەر بناغەی ویستی ئێمە بنیات‌نراون، بگێڕینەوە بۆ خۆمان. کەواتە بکەر و بەدیهێنەر لە هەردوو حاڵەتەکەدا هەر تەنها خوای گەورەیە. خۆ ئەمەش ئایەتی پیرۆزی: ﴿**والله خَلَقَكُم وَمَا تَعْمَلُونَ**﴾مان بیر دەخاتەوە.

ئیمان بەم مەسەلەیە یەکێکە لە پێداویستی و داخوازییەکانی ئایین. پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ ئاماژەی بۆ ئەم پێویستییە کردووە و، ئەو کەسانەش کە پێیان بەرەو فیکری "ئیعتیزال" دەخزێت بە "مەجووس"ی ئەم نەتەوەیە ناوی بردوون. ئەوەتا فەرموویەتی: "هەموو نەتەوەیەك مەجووسی تێدایە، مەجووسی نەتەوەکەی منیش ئەوانەن کە دەڵێن: قەدەر نییە"[3]. چونکە ئەوانە خێر و شەڕ بۆ خوای گەورە ناگێڕنەوە و پێیان وایە کە مرۆڤ بەدیهێنەری کردارەکانی خۆیەتی.

یەکەم جار وشەی "القَدَرية" بەوانە دەوترا کە باوەڕیان بە "جەبر" هەیە، بەڵام دوایی بەوانە وترا کە "ئینکاریی قەدەر" دەکەن، کە لە ڕاستیدا ئەمەیان لەگەڵ واتای فەرموودە پیرۆزەکەدا دەگونجێ. بەم جۆرە ئەم "ناو"ە خاوەنە ڕاستەقینەکەی خۆی

---

(١) (البخاري، المناقب ٢٧). (مسلم، صفات المنافقين ٤٣ - ٤٧).

(٢) (البخاري، الوضوء ٣٢، ٤٦. المناقب ٢٥. الأشربة ٣١). (مسلم، الزهد ٧٤، فضائل ٤-٦).

(٣) (المسند ٢/٨٦، ١٢٥ و ٥/٤٠٧). (ابن ماجه: مقدمة ١٠).

دۆزیەوە! لەم سەردەمەی خۆشماندا ئەم ناوە بە ڕێڕەوی موعتەزیلە دەوترێت، کە مەگەر چەند جیاوازی‌یەکی کەم، دەنا هەر لەسەر مەفهوومی پێشووی خۆی ماوەتەوە.

شانبەشانی ئەمەش ڕێڕەوی "جەبری"یەکان هەیە، کە "ئینکاریی ویستی مرۆڤ" دەکەن. خۆ وەك بە ڕوونی ئاشکرایە، ئەم بیرەش ڕاستیی نەپێکاوە.

بەڵام ڕێڕەوی ئەهلی سوننەت ناوەندەڕێ دەنوێنێت و، لە زیادەڕەوی و کەمڕەویی هەردوولا پارێزراوە و، ئەو ئەندازەیەی کە ڕاست و دروستە لە هەردوو ڕێڕەوەکەی تردا لەمیشدا هەیە و دەڵێت: خوای گەورە بەدیهێنەری کردەوەکانمانە، بەڵام داواکەر و داخواز ئێمەین. بۆیە بەرپرسیاریی کردەوەکانمان لە ئەستۆی خۆماندایە.

## ٨ - ویستی خوای گەورە و.. ویستی مرۆڤ.

هەرچەندە مرۆڤ خاوەنی ویست و ئیختیار بێت، کەچی هەر "خەلق" و "ئەمر" بە دەستی خوایە و، گەر هەر شتێك فەرمانی خوای لەسەر نەبێت هەرگیز نایەتە وجوود.. گەر نەیویستایە بەدیهاتووانی بەردەوام بن و بمێننەوە، هەموو شتێك هەپروون دەبوون..

کەواتە هەر خواوەند خۆی ملوانکەی گەوهەری "وجوود"ی بە گەردنی "عەدەم"دا هەڵواسیوە و دەرگاکانی ئاسمانی لەسەر تاریکستانی عەدەم خستووەتە سەرپشت و سەرانسەری گەردوونی بە وێنەی کتێب و پیشانگا پێش‌چاو خستووە و ڕووناکیشی ئاراستە کردوون، تاکو ئەو کتێبە بخوێنرێتەوە و پیشانگاکەش ببینرێت..

هەموو کانیاوەکان بە فەرمانی ئەو دەتەقێنەوە و.. لافاوەکانیش بە فەرمانی ئەو خوڕ دەبنەوە و.. چیاکانیش بە فەرمانی ئەو شەق دەبەن و بەردەکانیشی دێنە خوار و دەبن بە گڵ و باوەش بۆ ناوك و تۆوەکان دەگرنەوە.. دەشتایی و شیوەکانیش بە فەرمانی ئەو کاڵای ڕەنگاوڕەنگ دەپۆشن و سەرنجی زەوی و ئاسمان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن و.. هەر بە سروەی فەرمانی ئەویش سەرتاسەری زەوی وەك بەهەشتی لێ دێت و باخچە و بێستانەکان بە میوە و بەروبوومەکان پڕ دەبن و.. مەل و وردیلە باڵندەکانیش بە فەرمانی ئەو بە خەمباری دەخوێنن و.. تەنانەت هەموو زیندەوەرێك و گشت بێ گیانێکیش، هەریەکەیان بە زمانی خۆی، لە خوای گەورە دەلالێتەوە و ستایشی دەکات.

کەس ناتوانێت لافی خاوەنێتیی ئەم گەردوونە بێ‌پەی و فراوانە لێ بدات کە لێواری دیار نی‌یە. ئەم گۆی زەوی‌یە بە مەزنی‌یەکەی و ڕووبار و لافاو و دەریاکانیەوە، تەنها چەند دڵۆپێکی میهرەبانیی ئەون.. هەموو بوونەوەرانی گیاندار و بێ گیانیش تەنها گەردیلەیەکن لە گەنجینەکانی سامانی ئەو، چونکە نیعمەتەکانی ئەو خواوەندە لە ژمارە

نایەن و لە ڕەنووسدا جێیان نابێتەوە. کەواتە شوکرانە و سوپاس و پێزانین تەنها بۆ ئەوە، لەسەر ئەم هەموو نیعمەتانەی کە بە هەموانی بەخشیوە..

هەروەها تەنها هەر ئەو خواوەندەیە کە خاوەنی کارسازی و هەڵسوکەوتی فراوان و بینراوە لە هەموو بەشێکی گەردووندا و، بەخشەری سەرجەمی ئەو نیعمەتانەشە کە بە هەموو بوونەوەرێکی بەخشیوە..

هەروەها هەموو ئەو کردەوە چاك و پیرۆز و بەپیتانەی کە بە کردەوەی مرۆڤ هاتوونەتەدی، هەموویان هی خوای گەورەن، چونکە بەخشینی دڵنیایی بە دڵانی ئیماندار و، زانین و تێگەیشتنیش بە ژیریی پێشەوایانی حەقیقەت و، ڕشتنی ڕەوشتی بەرز و حیکمەتی ڕاست ـ دروست بەسەریاندا و، ڕێنمایی سەرانی عاشق بۆ سوجدە بۆبردنی.. هەموو ئەم کارانە، تایبەتن بە خوای گەورەوە..

هەموو کار و کۆششێکی ئەو کەسەش کە عینایەتی خوا ناناسێت و ڕێزی شایانی لێ ناگرێت، هەمووی بێ ئەنجامە و تەنانەت هەر شتێك خوای گەورە عینایەتی خۆی ئاراستە نەکات، سەرابێکی فانییە. چونکە کردەوەکانی مرۆڤ تەنها بە بیرکردنەوەی لە ڕەزامەندیی خوای گەورە دەبن بە عیبادەت و، ئەم عیبادەتانەش لە ڕێی چاودێری و پارێزگاریی خواوەندەوە هێندە فراوان و گەورە دەبن کە دەبن بەهۆی ڕزگاربوونی ئەو کەسانەی بوونەتە هۆکاری پەیدابوونیان. بە پێچەوانەی ئەمەشەوە هەرگیز ناتوانرێت مرۆڤ بگاتە هیچ شتێك و بەسەر ڕاستە شەقامدا تێبپەڕێت. واتە پێچەوانەی ئەمە ئەندێشەیەکی دوور لە حەقیقەتە..

دەستەواژەکانی: "من فلاّنە کارم کرد" و "من ئەو کارەم ڕێكخست" و "من فلاّنە کەسم ئاراستەی فلاّنە کار کرد".. ئەم چەشنە وتانە کە شانازی و لەخۆباییبوونی مرۆڤ دەنوێنن، هەر تەنها دەرچوونیان لە زاری مرۆڤ، کارێك دەکات شەیتان پێی ئەو مرۆڤەیان پێهەڵبخلیسکێنێت و لە ڕێ بیترازێنێت!

ئەو خواوەندە بەرز و بەتوانایەی کە بچووکترین شت دەخاتەگەڕ بۆ ئەنجامدانی گەورەترین ئەرك و کارمەندی.. ئەو کەسەی کە بە مێرووڵەیەك کۆشکی فیرعەونی دارماند.. ئالاّی موڵکی ئەو خواوەندە لە هەموو گۆشەیەکی گەردووندا دەشەکێتەوە. دەسا زەرەرمەندی بۆ ئەو کەسەی کە ناچێتە ژێر ئالاّکەیەوە. لە خوا داواکارین سایەی ئەو ئالاّیەمان هەر لەسەر بهێڵێتەوە.

بەڵێ، ئاسمان و زەوی لە ژێر فەرمانی ئەودان. ئێمەش بە دەست و پێ و چاو و گوێ و زمان و دڵ و ویژدان و هەناومانەوە، موڵکی ئەوین. ئەم ئەندامانەی جەستەمان

تەنها چەند پارچە گۆشتێکن لە مولکی یەکجار فراوانی ئەودا و چەند هۆکارێکی خاوەن هەستی تەواو بچووکن.

جا هەروەك هەموو ئەمانە تەنها هی خوای گەورەن، بە هەمان جۆر هەموو ئەو بەروبووم و سوودانەش کە لەم ئەندامانەوە پەیدا دەبن، هەموویان تایبەتن بە خواوەندەوە. چونکە ئێمە چۆن دەتوانین بڵێین: "زمانمان، دەنگمان، چاومان، گوێمان" گەر خۆی ئەم ئەندام و هەست و نەستانەی پێ نەبەخشینایە و ئەم بەروبوومانەشی لەو هەست و نەستانەوە نەهێنایەتەبەر؟ ئایا ئەو کاتە بەشی ئێمە لەو بەروبوومانەی کە لافی خاوەنێتی‌یان لێ دەدەین چەند دەبوو؟ خۆ سەرانسەری دنیا بە فەرمانی ئەو دەجووڵێتەوە و سەرتاسەری گۆی زەویش لە ڕێژنەی بەخششی ئەو پڕ بووە.

کەواتە گێڕانەوەی "وجوود" بۆ لای غەیری خوای گەورە کوفرێکی هێندە ستەمە کە لێخۆشبوونی بۆ نی‌یە و، چاونووقاندنیش سەبارەت بە بینینی دەستی چاکەی ئەو لە پشتی هەموو بەخششێکەوە، شیرکێکی ئابڕووبەرە.

دەسا ئەی خاوەنی ئەو سۆز و میهرەبانی‌یە فراوانەی کە تەنانەت شەیتانیش تەماعی تێ دەکات!

پەردە لەسەر چاوی ئەوانە لابدە کە دەڵێن: "من.. من".. هەروەها درەوشانەوەکانی خۆت بۆ ئەو کەسانەش دەربخە کە بە ڕێزلێنان و پێزانینەوە دەڕوانە کاروبارەکانت و.. دڵانی خاڵی و بەتاڵیش بە ناسینی خۆت پڕ بکە! ئامین.

### ٩ - قەدەر لە ڕووناکیی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودە پیرۆزەکاندا.

گەر لە ڕووناکیی ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە لەمەولا باسیان دەکەین مەسەلەی "قەدەر" شی نەکرێتەوە، ئەوا باسەکە لەگەڵ مەزهەبی ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا یەك ناگرێتەوە و، ناتوانین پارێزگاری لە خۆمان بکەین و بەرەو چەمکەکانی "ئیعتیزال" یان "جەبر" نەترازێین. بۆیە لەم بەشەی باسەکەماندا هەوڵ دەدەین ئەو ئایەت و فەرموودە پیرۆزانە شی بکەینەوە و بیانخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە کە پەیوەندی‌یان بەم بابەتەوە هەیە.

خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿مَا أَصَابَ مِن مُصِيبَةٍ فِي الأَرضِ وَلاَ فِي أَنْفُسِكُم إِلاَّ فِي كِتَابٍ مِن قَبلِ أَن نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللهِ يَسِيرٌ﴾(الحديد:٢٢).

بەڵێ، هەموو شتێك پێش ئەوەی پەیدا ببێت تۆمار کراوە و هیچ شتێکیش نی‌یە کە بەپێی ئەو تۆمارە ئاڵوگۆڕی بەسەردا نەیەت.

شارێگاکەی حەزرەتی محمد ﷺ داخوازی ئەم باوەڕەیە، بەڵام هەموو لادانێك لەم ڕاستە شەقامە لە ڕاستیدا، بەپێی گەورەیی و بچووکیی ئەو لادانە، بە: پێ ترازان و گومڕایی دادەنرێت.

لە سەرەتای ئەم کتێبەدا ئایەتە پیرۆزەکانمان خستە پێش‌چاو، وا ئێستاش هەندێ فەرموودەی پیرۆز دەهێنین کە تەفسیری ئەو ئایەتانە دەکەن.

١) عبداللهی کوڕی عەمری کوڕی عاص - خوایان لێ ڕازی بێت - دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(كتبَ اللهُ مقاديرَ الخلائقِ قبلَ أنْ يخلقَ السموات والأرض بخمسين ألف سنة. قال: وعرشه على الماء)[1].

لە ڕاستیدا ئێمە ئەو پێوەر و تەرازووە نازانین کە ئەم پەنجا هەزار ساڵەی پێ حساب دەکرێت. لەوانەیە پەنجا هەزار ساڵ یان پەنجا ملیۆن ساڵی زەمانی ئەم دنیایەی ئێمە بێت، لەوانەشە کینایە بێت لە "زۆری". ئێمە ناتوانین هیچ کام لەو واتایانە دەست‌نیشان بکەین. ئەوەندە هەیە کە دەزانین پەنجا هەزار ساڵ پێش بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی و پێش بەدیهێنانی بەری درەختەکەشیان کە مرۆڤە، هەموو شتێك تەقدیر و دەست‌نیشان کراوە.

لەبەر ئەوەی لە کتێبێکی تردا ئەم بڕگەیەی فەرموودەکەمان ڕوون کردووەتەوە کە دەفەرموێ: "وكان عرشه على الماء"، ئەوا پێویست بە دووپات‌بوونەوەی ناکات. بەڵام سەبارەت بە وشەی: "الماء" لە فەرموودەکەدا دەڵێین: لەوانەیە وەك هەندێ وتوویانە: مەبەست "العماء"[2] بێت. لەوانەشە ماددەی "ئەثیر" بێت. واتە عەرشی خوای گەورە لە سەر "ئەثیر" بووە کە ئەصلی ماددەی هەموو بەشەکانی گەردیلەیە. لەوانەیە هەموو بوونەوەران لە شکڵ و شێوە و دۆخی بوونێکی ئەثیریدا بووبن. ئێمە هیچ زانیاری‌یەکمان لەم بارەیەوە بە هیچ جۆرێك نییە و ناشتوانین‌بمانبێت. چونکە نە خۆمان و نە باوکە ئادەممان، تەنانەت سەرانسەری گەردوونیش، ئەو کاتە بەدی نەهاتبوون.

---

(١) رواه مسلم. القدر ١٦. (واتە: خوای گەورە پەنجا هەزار ساڵ پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی بەدی‌بهێنێت، تەقدیراتی هەموو بەدیهاتووانی نووسیوە و، عەرشەکەی خۆیشی لەسەر ئاو بووە).

(٢) العماء: السحاب. واتە هەور. لەوانەشە - وەك وتراوە - "العمى" بێت ئەو کاتەش واتاکەی بریتی دەبێت لەوەی کە: "هیچ شتێکی سابت و چەسپاو نەبووە" چونکە لەبەر ئەوەی "شت نەبووە" لە بەدیهاتووان نادیار بووە. بەو واتایەی کە خوای گەورە هەر بووە پێش ئەوەی مەخلووقاتیش بەدی‌بهێنێت و کەسی تر غەیری ئەو نەبووە. بڕوانە "تفسير ابن كثير" ٢٤٠/٤. (وەرگێڕی چاپی عەرەبی)

٢) عوبادەی كوڕی صامت - خوای لێ ڕازی بێت - كاتێ لە سەرەمەرگدا منداڵەكانی دەوریان دابوو، وەسیەتی بۆ دەكردن و "ئیمان بە قەدەر"ی وەك ئەمانەتێك پێ دەسپاردن و دەی‌وت:

یا بنيّ! إنك لن تجِدَ طعمَ حقيقة الإيمان حتى تعلمَ أنّ ما أصابَكَ لم يكنْ لِيُخطِئَكَ وما أخطَأَكَ لم يكنْ لِيُصيبَكَ. سمعْتُ رسول الله ﷺ يقولُ: (إنّ أوّل ما خلَقَ اللهُ القَلَمَ، فقال اكتبْ. قالَ: ربِّ وماذا أكتُبُ؟ قالَ: اكتبْ مقاديرَ كلِّ شيء حتى تقومَ السّاعة). يا بنيّ! إنّي سمعتُ رسول الله ﷺ يقولُ: (مَنْ ماتَ على غيرِ هذا فَلَيسَ مِنّي)[1].

٣) ئەو حەدیثەی كە حەزرەتی عبداللهی كوڕی عەبباس - خوایان لێ ڕازی بێت - ڕیوایەتی دەكات، گەلێ گرنگە بۆ ئەم باسەمان كە باسی "قەدەر"ە و، تەفسیری ئەو ئایەتەش دەكات كە نەختێك پێش ئێستا باس كرا.

عبداللهی كوڕی عەبباس - خوایان لێ ڕازی بێت - دەفەرموێت: ڕۆژێكیان لە پشتی پێغەمبەرەوە ﷺ بووم، پێی فەرمووم:

(يا غلام! إنّي أعلّمُكَ كلمات: احفظِ اللهَ يحفظْك، احفظِ اللهَ تجدْهُ تجاهَك، إذا سألتَ فاسألِ اللهَ وإذا استعنتَ فاستَعِنْ بالله. واعلم أنّ الأمةَ لو اجتمعَتْ على أنْ ينفعوكَ بشيءٍ لم ينفعوك إلاّ بشيءٍ قد كتبَهُ اللهُ لك، ولو اجتمعوا على أنْ يضرُّوك بشيءٍ لم يضرُّوك إلاّ بشيء قد كتبَهُ اللهُ عليكَ، رُفِعَتِ الأقلامُ وجفّتِ الصُّحُفُ)[2].

واتە: مافی ڕەوا بە فەرمان و داخوازییەكانی خوای گەورە بدە، تاكو شتێك بەرەو ئەودنیا ڕەوانە بكەیت كە لەوێ سوودت پێ بگەیەنێت. خۆ ئەگەر هەر شتێكت داوا كرد، جگە لە خوای گەورە لە كەسی داوا مەكە، زەلیلی و ملكەچی بۆ غەیری خواوەند مەنوێنە و جگە لە خۆی بۆ هیچ مەبەستێك پەنا بۆ كەس مەبە. چونكە هەر تەنها خوای گەورەیە كە داخوازییەكەت بۆ دەهێنێتەدی و گیروگرفتەكەشت بۆ چارەسەر دەكات. كەواتە گەر هەر خواستێكت هەبوو تەنها لەوی داوا بكە. خۆ ئەگەر لە هەر كەسێكی تری داوا بكەیت لە ئەنجامدا كارەكە هەر دەگەڕێتەوە بۆ لای

---

(١) رواه أبو داود. السنة ١٦. واتە: كوڕم! تۆ هەرگیز تامی حەقیقەتی ئیمان ناچێژیت هەتا نەزانیت كە ئەو شتەی دێتە ڕێت، نەدەبوو لابدرایە و نەهاتایەتە ڕێت و، ئەو شتەش كە نایەتە ڕێت هەرگیز نابێت بێتە ڕێت. لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: "خوای گەورە یەكەم جار "قەڵەم"ی بەدی‌هێنا و پێی فەرموو: بنووسە! قەڵەم وتی: چی بنووسم ئەی پەروەردگارم؟ فەرمووی: تەقدیراتی هەموو شتێك بنووسە كە تا قیامەت دێتە وجوود". كوڕم! گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: هەر كەسێك لەسەر غەیری ئەم باوەڕە بمرێت، لە من نییە.

(٢) رواه الترمذي، القيامة ٥٩. المسند ١/٢٩٣، ٣٠٣ - ٣٠٧.

خواوەند. كەواتە هەر تەنها خوای گەورەیە كارەكەت بۆ ئەنجام دەدات. لەبەر ئەوە هەرگیز رەنجت بەبا مەدە و دەستەوداوێنی ئەو هۆكارانە مەبە كە لە نێوان تۆ و خوای گەورەدان، بەڵكو بە كردار و گوفتار هەموو هۆكارێك لەو ناوەندەدا لا بە و باش بزانە كە سەرجەمی هۆكارەكان وەك تۆ دەستەوسانن و، هەر خواوەند خۆیەتی كە دەتوانێت خواستەكانت بۆ بهێنێتەدی، چونكە كلیل و جڵەوی ئاسمانەكان و زەوی تەنها بە دەستی خۆیەتی و جگە لە خۆی كەسی تر كاری تەقدیر و دەستنیشان كردنی شتانی لە توانا و دەسەڵاتدا نییە و.. هەر خۆی بەدیهێنەرە و هەر خۆشی بەدیهاتووانی دەخاتە گریان و پێكەنین و هەر ئەو عیززەت دەبەخشێت بەو كەسەی ویستی لەسەری بێت و ئەوانەش زەلیل دەكات كە خۆی دەیەوێت زەلیل بن. بە رادەیەك كە ئەگەر هەموو خەڵكی بە هەڵەداوان و پێشبڕكێ بێن بە دەنگتەوە تاكو سوودت پێ بگەیەنن یان فریات بكەون یاخود لەو بەڵایە رزگارت بكەن كە پێوەی دەتلێیتەوە، ئەوا هەموو ئەو كردارە چاكانەیان لە ناوەندی تەقدیری خواوەندایە و ئەگەر ئەو نەیویستایە، ئەوان نەیاندەتوانی ئەو سوودانەت پێ بگەیەنن، ئەو كردارە خراپانەش بە هەمان جۆر كە خەڵكی دەیانویست ئەنجامیان بدەن. چونكە ئەوەی خرابووە ئەستۆی قەڵەمەوە كە بیاننووسێت هەموویانی نووسی و نووسینەكانیش وشك بوونەوە. واتە تازە هیچ ئاڵ و گۆڕێك لەو نووسینانەدا ناكرێت.

پێغەمبەر ﷺ بەم فەرموودە پیرۆزەی كە یەكێكە لە "جوامع الكلم"، ئیبن عەبباسی زانا و عەلامەی نەتەوەی ئیسلام لە قووڵترین "مەسەلەی قەدەر" تێ دەگەیەنێت.

جا ئەوانەی كە لە دواپلەكانی بەندایەتی و ئیخلاسدان ئاوا لە "قەدەر" تێ دەگەن.

بەڵێ، قەدەر مەسەلەیەكی حاڵی و ویجدانییە. واتە هەموو مرۆڤێك لە ناخ و ویجدانی خۆیدا هەست بە هەموو ئەم راستییە ناوبراوانە دەكات، تەنانەت ویجدانی پڕە لەم راستییانە. بە رادەیەكی ئەوتۆ كە دەتوانرێ بوترێت: بابەتی قەدەر یەكێكە لەو مەسەلانەی كە پێغەمبەر ﷺ زۆر جەختی لەسەر كردووە و، شەش كتێبەكانی فەرموودەش پڕن لەم چەشنە حەدیثانە. كەواتە دەبێ "قەدەر" لە رۆشنایی ئەو فەرموودانەدا باس بكرێت، چونكە ئەم باسە شایانی ئەوەیە بە تەواوی لێی بكۆڵرێتەوە و تاوتوێ بكرێت. تەنانەت ئەم كارە گەلێ پێویستە.

مەجووسەكان باوەڕیان وایە كە دوو هێزی جیاواز هەن: یەكێكیان هی كاری خێرە و ئەوی تریشیان هی كاری شەڕە. خۆ ئەم چەشنە ئیمانە خوای گەورە دەخاتە زۆران و ململانێ لەگەڵ شەیتاندا و وا پیشان دەدات كە - پەنا بەخوا - هیچ كامیان دەست لە كاری ئەوی تر وەرنەدات!

كەچی ئایینی ئیسلام بە تەواوەتی دژ و پێچەوانەی ئەم بیر و باوەڕەیە، تەنانەت ئیعلانی جیهادیشی بەرامبەر بەم چەشنە بیر و بۆچوونانە ڕاگەیاندووە. ئەوەتا ئێمە باوەڕمان وایە كە خوای گەورە تاك و تەنیایە و چ لە زاتی خۆیدا و چ لە كردەوەكانیدا هیچ شەریك و هاوبەشێكی نییە و جگە لە خۆی هیچ كەسێكی دیكە پەروەردگار نییە و هەر ئەوە كە بە ویستی خۆی و چۆنی بوێت دەستكاریی مولكی خۆی دەكات و هەموو دەسەڵاتێك هەر تەنها هی ئەوە و هەموو هێزێكیش هەر تەنها بە دەستی خۆیەتی. ئەم حەقیقەتەش لەو ذیكرەوە وەردەگرین كە لە سوننەتدا هاتووە و بەیانی و ئێواران دەخوێنرێت و بریتییە لە: "لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير"(١).

ئێمە لە ڕووناكیی ئەم حەدیثە پیرۆزەوە باوەڕمان بە: تەوحیدی خوایەتی و، تەوحیدی سیفەتە مەزنەكانی و، تەوحیدی كردارە حەكیمەكانی هەیە.

گێڕانەوەی هەموو شتێك بۆ خوای گەورەی تاك و تەنیا، مەسەلەیەكی گرنگە لە ئیمانەكەماندا، تەنانەت بریتییە لە كاكڵە و پوختەی ئیمانەكەمان.

٤) ئێستا با لە گۆشەی ئەم ڕیوایەتەی ئیمامی عەلییەوە - خوای لێ ڕازی بێت - بڕوانینە ئەم مەسەلەیە:

حەزرەتی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - دەفەرموێ: بە بۆنەی بەخاك سپاردنی یەكێك لە هاوەڵەكانەوە، لە گۆڕستانی "بقيع الغرقد"دا بووین، پێغەمبەریش ﷺ تەشریفی هێنا بۆ لامان و دانیشت و ئێمەش بە دەوریدا دانیشتین. لەو كاتەدا چیلكەیەكی بەدەستەوە بوو، ئنجا سەری داخست و، بە چیلكەكەی دەستی خەتی بچووك بچووكی یەك لە دوای یەكی لە گڵەكەی بەردەمیدا دەكێشا. پاشان فەرمووی: (ما منكم من أحدٍ، ما من نفسٍ منفوسةٍ، إلاّ وقد كتبَ اللهُ مكانَها من الجنةِ والنار، إلاّ وقد كُتِبَتْ شقيَّةً أو سعيدةً). واتە: هیچ كەسێك نییە لە ئێوە كە شوێنی لە بەهەشت یان لە دۆزەخدا دیاری نەكرا بێت و بە "بەدبەخت" یان "بەختەوەر" نەنووسرابێت. لەم كاتەدا پیاوێك عەرزی كرد: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا ئیتر بۆچی ئێمە چاوەڕوانی ئەو نووسراوە نەكەین و واز لە كردەوەكانمان نەهێنین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر كەسێك لە ئەهلی سەعادەت و بەختەوەری بێت دەچێت كرداری ئەهلی سەعادەت دەكات و ئەو كەسەش كە لە ئەهلی شەقاوەت و بەدبەختی بێت دەچێت كردەوەی ئەهلی شەقاوەت دەكات. ئەوەبوو فەرمووی: (اعملوا؛ فكلٌ مُيَسَّرٌ

(١) البخاري، التهجد ٢١، الأذان ١٥٥.

لِما خُلِقَ له: أمَّا أهلُ السعادة فَيُيَسَّرُونَ لِعملِ أهلِ السعادة، وأمَّا أهلُ الشَّقاوةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعملِ أهلِ الشقاوة)! پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿فأمّا مَن أعطَى وَاتقَى * وَصَدّقَ بالحُسنَى * فَسَنُيَسِّرُهُ لليُسرَى * وأمّا مَن بَخِلَ واستَغنَى * وَكَذّبَ بالحُسنى * فَسَنُيَسِّرُهُ للعُسرَى﴾(الليل:٥-١٠)[1].

بەڵێ، ئەو کەسەی کە بۆ بەهەشت خوڵقێنرابێت، دڵی بە نەشوەی عیبادەت و خواپەرستی پڕ دەبێت و بە تەواوەتی نەفرەت لەو شتانە دەکات کە خواوەند نەهیی لێ کردوون، بۆیە گرتنەبەری ڕێگای مزگەوتی بۆ ئاسان دەکرێت و ڕێگای ئەو شتانەشی لێ دەبێت بە زەحمەت کە نەهییان لێ کراوە..

بەڵێ، کار بکەن.. چونکە هەر کەسێك ئەو کارەی بۆ ئاسان دەکرێت کە بۆ ئەنجامدانی بەدیهێنراوە، ئەوەتا ڕێی بەهەشت لە مزگەوتەوە تێپەڕ دەبێت و بە شوێنپێ هەڵگرتنی پێغەمبەر ﷺ دەگاتە قۆناغ. خۆ ئەو کەسەی کە لە ژیانیدا سوژدەی بۆ خوای گەورە نەبردووە و دڵ و ویژدانی نەکردووە بە ئاوێنەیەکی ئەوتۆ فەرمانەکانی بەدیهێنەریان تێدا ڕەنگ بداتەوە، هەرگیز پێی ناوترێت ڕێی بەهەشتی گرتووەتە بەر. واتە ئەو کەسەی لە ئەهلی سەعادەت بێت لە ئەنجامدا ئەو کردارانە جێبەجێ دەکات کە شایستەی ئەوەی دەکەن بچێتە بەهەشت. ئەو کەسەش لە ئەهلی شەقاوەت بێت لە ئاکامدا چەند کارێك ئەنجام دەدات کە بە هۆیانەوە شایستەیی چوونە ناو دۆزەخ بەدەست بهێنێت. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە پێغەمبەر ﷺ بەیانی و ئێوارە ئەم دوعایەی دەخوێند: (اللهم! أحسِنْ عاقبَتَنا في الأمورِ كُلِّها وأجِرْنا مِنْ خِـزي الدنيا وعذابِ الآخرة)[2]. دەبینین پێغەمبەر ﷺ ئایەتەکانی (٥-١٠)ی سوورەتی "الليل" دەهێنێت و دەیانکات بە بەڵگە لە سەر فەرموودە پیرۆزەکەی خۆی. ئەمەش گشت ئەو واتا مەزنانەی خوارەوەمان یاد دەخاتەوە:

هەر کەسێك ماڵ و سامانی خۆی و هەرچییەکی هەیە لە پێناوی خوای گەورەدا بەخشێت و بەختی بکات، ئەوا دەڕواتە ناو بازنەی "تەقوا" و، سوود لە یاساکانی خوا وەردەگرێت. واتە دڵی پڕ دەبێت لە تەقوا و ڕێزلێنان، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی پەنا بباتە بەر پارێزگاریی خواوەند و، ئیتر دەزانێت پەنا و پشتیوانی تەنها خوای گەورەیە. واتە گەر مرۆڤ لە ڕێی بەندایەتی و ملکەچبوونیەوە بۆ خوای گەورە لە لایەن

(١) رواه البخاري: التفسير (٩٢)، ٧ القدر ٦ التوحيد٥٤. ورواه مسلم: القدر ٦ – ٨.

(٢) (واتە: خوایە گیان! ئەنجامی هەموو کارێکمان بە باشی کۆتایی پێ بهێنە و، لە ڕسوایی دنیا و سزای دوارۆژ پەنامان بدە) موسنەدی ئیمامی ئەحمەد ١٨١/٤.

خواوەندەوە لە هەموو كارێكیدا تەوفیقی بەدەست هێنا و پشتی بە خوا بەست و باوەڕی بە ناوە جوانەكانی خواوەند و هەموو ئەو شتانە هێنا كە بە دڵنیایی دەزانرێت بەشێكن لە دین و ئیمان، ئەوا خوای گەورە ڕێی بۆ ئاسان دەكات و بە وێنەی ئەو لافاوەی كە دەڕوات تا دەڕژێتە شوێنی دیاریكراوی خۆی، ئەمیش بەرەو ئامانجەكانی دەڕوات هەتا پێیان دەگات و، لە شوێنی خۆیدا چێژ و لەزەت لە هەموو كردەوەكانی چەشنی: "نوێژ و زەكات و حەج و جیهاد"ی وەردەگرێت. تەنانەت ئەو كەسانەی كە پەی بە لەزەت و خۆشحاڵیی ئەم شتانە نابەن بە سەرسامییەوە دەڕواننە ئەم مرۆڤە یاخود بە "شێت" ناوی دەبەن! تا وای لێ دێت نەترسانی ئەو كەسە لە مردن و، سەخاوەتی لەڕادەبەدەری ئەو دەبێت بە ویردی سەر زمانی خەڵكی، تەنانەت كارەكانی ڕۆژانەی و وازهێنانی لە چێژ و لەزەتە تایبەتییەكانی خۆی بە كاری دەراسا(خارق) لە قەڵەم دەدرێت.. هەموو ئەمانەی بۆ ئەنجام دەدرێت چونكە خوای گەورە ڕێگایەكی بۆ ئاسان كردووە كە بەرەو پێشتری ببات..

بەڵام بە پێچەوانەی ئەمەوە، واتە گەر مرۆڤ ڕەزیلی بكات و هیچ شتێك بە كەس نەدات، با باش بزانێت كە هیچ شتێك نادرێت بە كەسێك كە نەبەخشێت و شت بە كەس نەدات! خۆ ئەگەر بیدایە، ئەوا خوای گەورەش دەیدایێ و پێی دەبەخشی.. ئایا چیی پێ دەبەخشی؟.. دیارە "حوسنا" واتە: "عاقیبەتخێری"ی پێ دەبەخشی..

جا ئەو كەسەی نەیبەخشی و خۆی بە دەوڵەمەند زانی، واتە لە ناخی دەروونی خۆیدا "بوون"ی خۆی دەبینی و وای دادەنا كە پێویستی بە خوای گەورە نییە، لە كاتێكدا كە دەبوو "بوون"ی ئەوی ببینیایە و پشتی پێ ببەستایە.. بە واتایەكی تر وەكو قاروون لە خۆی بایی ببێت كە وتبووی: ﴿إنما أوتيتُه على عِلمٍ عِندي﴾(القصص:٧٨).. هەروەها هاتوچۆی مزگەوت بە كۆنەپەرستی لە قەڵەم بدات و بە چاوی سووك بڕوانێتە ئەهلی مزگەوت و.. "حوسنا" واتە خاوەنی ناوە جوانەكان - كە خوای گەورەیە - بە درۆ بخاتەوە و.. باوەڕ بەو پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ نەكات كە تیشكۆی درەوشانەوەی ناوە جوانەكانە و.. بایەخ بەو قورئانە پیرۆزە نەدات كە ڕوونكەرەوەی ئەزەلیی درەوشانەوەی ناوە جوانەكانی خوایە.. ئەو كەسەی ئەمە حاڵیەتی، ڕێگای سەختی دەخرێتە پێش. لەوانەشە هەندێ جار ژیانێكی ئایینی وەك نوێژكردن و ڕۆژووگرتنیشی ببێت، بەڵام بە بێزاری و تەمبەڵییەوە بیانكات و حەز نەكات لەناو پێخەف و نوێنەكەیدا بێتە دەرەوە بۆ نوێژی بەیانی. ئنجا تا بەم جۆرە كات و ژیانی لێ بڕوات لە ئەنجامدا وای لێ دێت كە جەماعەت و خواپەرستیش واز لێ دەهێنێت، تەنانەت هەندێ جار كە فەرمانێكی خواوەند لە بەردەم خۆیدا دەبینێتەوە بە وێنەی

کەسێکی لێ دێت کە ببورێتەوە و، بە پێچەوانەی ئەوەی لێی داوا کراوە ڕەفتار دەکات و، لە دەمی بچووکترین تەکلیفی خواوەندا بێزاری پیشان دەدات، چونکە ڕێگای سەختی خراوەتە پێش. ئەو کەسەی کە ئەمە حالیەتی کتومت وەك کەسێك وایە کە بە کۆڵێکی قورسەوە بۆ سەر چیایەك سەر بکەوێت، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە وەصفی کردووە: ﴿سأرهقه صَعُوداً﴾(المدثر:١٧).

بەڵێ، هەندێ کەس هەن کانی "خەڵووز" دەدۆزنەوە و بەردەوام بە دوایشیدا دەگەڕێن.. هەندێ کەسی تریش کانی "زیو".. هەندێکی تر "مس".. هەندێکی تر "زێڕ" دەدۆزنەوە، بەڵام گەلێ کەسی دیکەش هەن کە نوقمی ناو "زێڕابە چەپەڵەکان" دەبن!

ئەو شتانەی کە ڕێگا بۆ مرۆڤ ئاسان دەکەن، بریتین لە: پارێزگاریی دڵساغی و، دەستبەردار نەبوون لە ڕاستگۆیی و ڕاستی(الصدق) و، ڕووکردنی تەواوەتی ڕووەو خوای گەورە و، بەخشین لە پێناوی‌دا و، چاوەڕوانیی گیرابوون(الإستجابة) لە لایەن خواوەندەوە و، باوەڕهێنان بە ناوە جوانەکانی و، دوورەپەرێزیی لەوەی کە مرۆڤ پێی وابێت پێویستی بە خوا نیيە و، بە ویستە لاوازەکەی و زانستە کەمەکەیەوە بەخۆی نەنازێت و، باوەڕی وابێت کە هەموو شتێکی لە لایەن خواوەندەوە پێ بەخشراوە و، خۆی و سامانیشی لە پێناوی خوای گەورەدا بەخت بکات..

بەڵێ، ئەمانە هەندێکن لەو شتانەی کە ڕێگا بۆ مرۆڤ ئاسان دەکەن. هەر کردارێکی پێچەوانەی ئەمانەش بە ڕادەیەك ڕێگا لە مرۆڤ سەخت و دژوار دەکەن کە نەتوانێت پیای‌دا تێبپەڕێت.

حەزرەتی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - کە ئەم فەرموودەیە ڕیوایەت دەکات، دەفەرموێ: دوای ئەوەی کە هاوەڵەکان ئەم فەرموودەیەیان لە پێغەمبەر ﷺ بیست، لە خواپەرستی‌دا گەیشتنە پلەیەکی بەرز و، چاکیان لێ کرد بە لادا و بە ڕۆژ و بە شەو خەریکی خواپەرستی دەبوون. بەو واتایەی کە تێگەیشتن لەوەی: مرۆڤ هەر ڕێگایەك بگرێتە بەر دەگاتە کۆتایی ئەو ڕێیە. واتە هەر کەسێك هەنگاو بنێت و بڕوات، لە ئەنجامدا هەر دەگات.

بەڵێ، هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ بەم جۆرە لە "قەدەر" گەیشتبوون. خۆ ئەم چەشنە ئیمانە هەرگیز مرۆڤ بەرەو تەمبەڵی ناداتە بەر، بەڵکو ڕووەو کار و تێکۆشانی بەردەوام هانی دەدات. چونکە ئەو هاوەڵانە بە باشی تێگەیشتبوون لەوەی کە: هەر ڕێگایەك بگرینە بەر ئەوا ئەنجام و کۆتایی ئەو ڕێگایەمان بۆ تەقدیر کراوە، بۆیە هەمیشە تێدەکۆشان تاکو بگەنە ئەنجام و دوا قۆناغی ئەو ڕێیە.

ئەوەتا زەرەرمەندی بۆ ئەوانەیە کە ڕێی مزگەوتیان نەگرتوەتە بەر و سوژدەیان بۆ خوای گەورە نەبردووە و بە ڕێی ئیمانداراندا نەڕۆشتوون و هەموو کات و جەژنەکانیان لە چایخانە و مەلها و مەیخانەکاندا بەسەر دەبەن. ڕێی ئەم جۆرە کەسانە ڕێی گومڕاییە و ئەنجام و کۆتاییەکەشی بریتییە لە "سەقەر"(١).

سوپاس و ستایشێکی زۆر و لەژمارەبەدەر بۆ خوای گەورە کە ڕێی ئیسلامی بۆ ئاسان کردین و خستینیە سەر ڕێی مزگەوت، بە وێنەی ئەوەی کە شەونمی لەسەر گەڵا ناسکەکان داناوە و، دڵیشمانی کردووە بە ئاوێنەیەکی ڕووناکیدەرەوەی نوورەکانی قورئانی پیرۆز کە خۆری هەموو خۆرەکانە و، بە فەزڵ و بەخشایشی خۆیشی نیعمەتی شوێنکەوتنی پێغەمبەرە ئازیز و خۆشەویستەکەی خۆی ﷺ پێ بەخشیوین. هەر لەو خوایەش دەپاڕێینەوە کە نیعمەتەکەمان بۆ تەواو بکات و بەردەوامیی نیعمەت و شوکرانەی نیعمەتیشمان پێ ببەخشێت.

٥) حەزرەتی عبداللّٰهی کوڕی عەمری کوڕی عاص - خوایان لێ ڕازی بێت - دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: "جارێکیان پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە بۆ لامان و دوو کتێبیشی بەدەستەوە بوو. فەرمووی: دەزانن ئەم دوو کتێبە چین؟ عەرزمان کرد: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا! مەگەر خۆت پێمان بڵێیت. پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بەوەی دەستی ڕاستی فەرمووی: (ئەمە کتێبێکە لە لایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەکانەوە، ناوی ئەهلی بەهەشت و ناوی باوك و تیرە و عەشرەتەکانیشیانی تێدایە، پاشان مۆر لە ئاخرەکەی نراوە؛ نە لێیان زیاد دەکرێت و نە هەرگیز لێشیان کەم دەکرێت). ئنجا سەبارەت بەوەی دەستی چەپیشی فەرمووی: (ئەمەش کتێبێکە لە لایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەکانەوە ناوی ئەهلی دۆزەخ و ناوی باوك و تیرە و هۆزەکانیشیانی تێدایە و، پاشان مۆر لە ئاخرەکەی دراوە؛ هەرگیز کەسیان لێ زیاد و کەم ناکرێت). هاوەڵەکانی عەرزیان کرد: ئەگەر هەموو شتێك بڕابێتەوە و کۆتایی پێ هاتبێت ئیتر ئەی پێغەمبەری خوا کردەوەکانمان بۆچی بکەین؟! فەرمووی: (ڕاست بن و خۆتان لە کردەوەی چاك نزیك بخەنەوە، چونکە مرۆڤی بەهەشتی هەر کردەوەیەکی کردبێت لە ئەنجامدا بە کردەوەی ئەهلی بەهەشت کۆتایی بە کردەوەکانی دەهێنرێت.. ئەهلی دۆزەخیش، با هەر کردەوەیەکی ئەنجام دابێت، لە کۆتاییدا بە کردەوەی ئەهلی دۆزەخ دوایی بە کردارەکانی دەهێنرێت). پاشان پێغەمبەر ﷺ دەستەکانی ڕاتەکاند و ئەو دوو کتێبەی لادا و، ئنجا فەرمووی: (خوای گەورە لە کاری بەندەکانی بووەتەوە و،

---

(١) ئەو واتایانەی کە لەم بڕگەیەی سەرەوەدا هاتن ئاماژەن بۆ ئایەتەکانی (٢٦-٣٠)ی سوورەتی "المدثر".

تاقمێکیان لە بەهەشت و تاقمێکیان لە دۆزەخدان)[1].

وا هەوڵ دەدەین ئەم مەسەلەیە بە ڕووداوێك ڕوون بکەمەوە کە خۆم دیومە و تیای‌دا ژیاوم:

لای سەری خۆشەویستێکمەوە ئامادە بووم کە بەدەم نەخۆشیی "مۆمکردنی جگەر"(تشمع الكبد)ەوە گیانی دەدا. لەتاو زۆریی ئازار پێچی دەدا و زمانیشی هێندە ئاوسا بوو کە لەناو دەمی‌دا هەڵ نەدەسووڕا! بەڵام زانیم شتێك دووپات دەکاتەوە، کە گوێی خۆمم لێ نزیك خستەوە هەستم کرد وەك بڵێی دڵی لە بریی زمانی دەی‌وت: "لا إله الا الله"! چونکە بە ژیانی غەریبی دەژیا و لەو غەریبی‌یەش‌دا گرفتاری نەخۆشی‌یەك بووبوو کە ئومێد وایە پلەی شەهادەتی دەست‌بخات. لەو کاتەش‌دا خۆشەویستانی دەورەیان لێ دابوو هەموویان دوعای خێریان بۆ دەکرد. وەك بڵێی خوای گەورە هەموو هۆکارێکی چوونە بەهەشتی بۆ ئامادە کردبوو. ئەوەبوو لە دەمی جێ‌بەجێ کردنی فەرزی حەج‌دا نەخۆش کەوت و، کە گەڕایەوە پێش ئەوەی چاوی بە خزمەکانی بکەوێت، یەکسەر لە خەستەخانەی "ئیزمیر"دا خستیان. ئەم مرۆڤە دەستکەوتێکی گەورە چاوەڕوانی بوو، هەر چەندەش لە ڕواڵەت‌دا بە مەزلووم و داماو پێش‌چاو دەکەوت. (من خۆم بەپێی ڕواڵەتی حاڵی شایەتیی ئیمانی بۆ دەدەم و، گەر ڕێم پێ بدرێت ئامادەم لە ڕۆژی قیامەتیش‌دا هەمان شایەتیی بۆ بدەم).

بەڵێ، گەر مرۆڤ ئەهلی بەهەشت بێت، خوای گەورە بە کردەوەی ئەهلی بەهەشت کۆتایی بە کردەوەکانی دەهێنێت. بەڵام گەر وا نەبێت ئەوا عاقیبەتی بە پێچەوانەی ئەوی یەکەمەوە دەبێت. لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە نائومێدی کردەوەی چاکمان نەکات و کردەوەی ئەهلی بەهەشتیشمان پێ ببەخشێت. ئامین.

ئێمە باسی "ویستی مرۆڤ" و "بەدیهێنانی کردەوەکانمان لە لایەن خوای گەورەوە" کرد. لە ڕاستی‌دا ئەو شتەی کە ناوی "ویست"مان لێ ناوە نازانین حەقیقەتەکەی چی‌یە، تەنانەت چۆنێتی‌یەکەشی سەبارەت بە ئێمە شتێکی نەزانراوە، چونکە خاوەنی "بوون"ێکی گوێرەیی‌یە نەك دەرەکی. لەگەڵ ئەوەش‌دا ئەم ویستەی مرۆڤ بووە بە مەرجێکی عادەتی بۆ بەدیهێنانی کردارەکانمان لە لایەن خواوەندەوە. لەبەر ئەوە و لەم ڕووەوە گرنگیی بەدەست هێناوە..

بەڵام ئایا ئەو ئەرك و کارمەندی‌یانەی کە لە ئەستۆی ویستی مرۆڤ‌دان، چین؟ هەروەها ڕۆڵیان لەو کردارانەدا چی‌یە کە مرۆڤ دەیانکات؟ ئەمانە هیچیان بە

---

(١) رواه الترمذي: القدر ٨ ، مسند الإمام أحمد بن حنبل ١٦٧/٢.

تەواوەتی دەستنیشان نەکراون. بەڵام ئەو شتەی کە دەتوانین بە دڵنیاییەوە دانی پێدا بنێین بریتییە لەوەی کە: خوای گەورە بە کردەوە چاکەکانمان دەمانخاتە بەهەشت و، بە کردەوە خراپەکانیشمان بەرەو دۆزەخ - خوا بمانپارێزێت لێی - دەماندادتە بەر. چونکە هەروەك چاکەکاران بەهۆی "ویست"ی خۆیانەوە دەبن بە شایستەی چوونە بەهەشت، خراپکارانیش بە هەمان جۆر بەهۆی "ویست"ەکەیانەوە دەڕۆنە دۆزەخ. وەك لە ئایەتەکانی (١٣-١٤)ی سوورەتی "الإنفطار"دا هاتووە[1].

بەڵام ئایا کاری مرۆڤ لەم حاڵەدا (واتە لە ویستی‌دا) چی‌یە؟ هەروەها ئەندازەی دەستوەردانی لە خێر و شەڕدا چەندەیە؟ تا چەندەش دەبێت بەهۆی ئەو بەدیهێنانەی کە خواوەندی بەدیهێنەر ئەنجامی دەدات؟ هەموو ئەم پرسیارانە و پرسیارەکانی تری هاوچەشنیان بە ناچاری حەوالەی خواوەندی "علام الغیوب" دەکەین.

بەڵام دەڵێین: کتێبێك زووتر نووسراوە و ئەم کتێبەش بە چەند شێوە و جۆرێکی جۆراوجۆردا تێپەڕیوە، چونکە پێش بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی، نەخشە و پلانێکی گشتی بڕیار دراوە و نووسراوە و، موقەددەراتی هەموو یەکێك بە ئەستۆیاندا هەڵواسراوە. ئێمە ناتوانین لە دەرەوەی شتان و ڕووداوەکانەوە بیر لە "خۆمان" و "ویستمان" بکەینەوە، بۆیە کاتێ دەوترێت: "قەدەر" ئەوا ئێمە خۆمان و سەرجەمی ویست و ئارەزووەکانیشمان - بە واقیعی - لە ناوەندی ئەو بازنەیەداین و لەگەڵ شتان و ڕووداوەکانداین. چونکە هەر شتێك پەیوەندیی بە ئێمەوە بێت و لە ناوەندی ئەو ڕووداوانەدا بێت کە دێنە وجوود، پابەندە بە ویستی خۆمانەوە. هەرچەندەش ناتوانین پێوەرێك بۆ ئەو "ویست"ە دابنێین، بەڵام هەرگیز گومانمان لە بوونیدا نی‌یە.

"قەدەر" بریتی‌یە لە ڕوانینی خوای گەورە لە ڕوانگەیەکی بەرزەوە بۆ هەموو شتێك - کە ویستی ئێمەش دەگرێتەوە - و بینینی "سەرەتا" و "کۆتایی" بە وێنەی کاتی "ئێستا". قەدەر، بەم واتایە، جێی چەمکی "ئیعتیزال" و "جەبر"ی تێدا نابێتەوە. بەو واتایەی کە هەموو ئەو کردارانەی پەیوەندی‌یان بە ویستی ئێمەوە هەیە، بە وێنەی گشت ئەو کردارانەی تر کە پەیوەندی‌یان بە ویستمانەوە نی‌یە، هەر هەموویان لای خوای گەورەوە زانراون و تەقدیر کراون. بەڵام ئەو کردەوانەی بە ویستی خۆمان دەیانکەین - مەودای فراوانی‌یان هەر چەندەش بێت - مەیل و ویستی مرۆڤی تێدا ڕەچاو کراوە و بەپێی ئەو ویست و مەیلە تەقدیر کراون.

وتمان خوای گەورە چەند نووسینێکی جۆراوجۆری هەیە. چونکە ئەو شتانەی کە قەڵەمی قەدەر لە "لەوحی مەحفووظ"دا نووسیونی، مەلائیکەتە بەڕێزەکان بە

---

(١) مەبەست ئەم دوو ئایەتەیە: ﴿إنَّ الأبرارَ لفي نَعيمٍ ● وإنَّ الفُجَّارَ لفي جَحيمٍ﴾.

قەڵەمەکانی خۆیان لە بەری دەنووسنەوە. جا ئەم کتێبانەی کە مەلائیکەتان نووسیویانن هی هەرکەسە و بە ئەستۆی خۆیدا هەڵواسراوە. واتە هەموو کردەوەکانی سەرتاسەری درێژایی ژیانیان پێش ئەوەی ڕوو بدەن لەم کتێبەدا نووسراون: لە کوێ و.. چۆن و.. کەی ئەنجام دەدرێن. خۆ ئاشکرایشە کە "ویست"ی مرۆڤ لەم نووسینە جیا نییە، بەڵکو لە ناوەندیدایە، واتە هەموو ئەو کردەوانەی کە لەو کتێبەدا نووسراون مرۆڤ بە ویستی خۆی دەیانکات و پاشان مەلائیکەتان ئەو کردەوانە تۆمار دەکەن کە ئەنجامدراون[1]. پاشان گەر بێت و هەردوو نووسراوەکە بەراورد بکرێن ئەوا وەکو یەك دەردەچن. چونکە ئەو کتێبەی کە لە لایەن خواوەندی عەلیم و خەبیرەوە نووسراوە، کە زانینی ئەو هەموو شتێکی ناو بوونەوەری گرتووەتەوە و ئاگای لە هەموویانە، هەرگیزاوهەرگیز پێچەوانەی ئەو کتێبە نابێت کە مەلائیکەتان دوای ئەنجامدانی کردەوەکانی مرۆڤ تۆماریان کردووە. چونکە لەبەر ئەوەی پێشتر هەموو کردەوەیەکی مرۆڤ لە "زانین"ی خوای گەورەدا "زانراو"ە، ئەوا هەموو ئەو کردەوانە لە کتێبی یەکەمدا نووسراون. بەڵام کتێبی دووهەم لەو کاتەدا نووسراون کە ئەو کردەوانە ئەنجام دەدەین. جا ئەم دوو کتێبە تەنانەت لە بچووکترین پیتیشیاندا وەکو یەك وان و لە یەکتر دەچن! ئێمە ئەم مەسەلەیە بەم جۆرە دەردەخەین و جەختی لەسەر دەکەین، تاکو نەبین بەهۆی هیچ تێگەیشتنێکی هەڵە و ناتەواو.

یەکێك لە ڕووەکانی ئەم نووسینە لە شێوەی عەهد و پەیمانێکدا نووسراوە کە لێمان وەرگیراوە کاتێ کە لە جیهانی "ڕۆح" یان جیهانی "میسال" یان جیهانی "گەردیلەکان"دا بووین. ئێمە هەمیشە لە ویجدانی خۆماندا هەست بە ڕەنگدانەوەکانی ئەم نووسینە دەکەین. ئەوەبوو خوای گەورە ویستی وابوو کە لە سەرووی کات و زەمانەوە بڕیارێك بدات و ئێمەش بە "بَلـــی" وەڵامی ئەو بڕیارەی خوای گەورەمان دایەوە. ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە ئەم مەبەستەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە:

﴿وإذ أخذَ ربُّكَ مِن بَني آدمَ مِن ظُهورهِم ذُرِّيَّتَهُم وَأشهَدَهُم على أنفُسِهِم ألَستُ بِرَبِّكُم قَالُوا بَلى شَهِدنا أنْ تقولوا يوم القيامة إنّا كنّا عن هذا غافلين ۞ أو تقولوا إنما أشركَ آباؤنا من قَبل وكنّا ذريةً من بعدهم أفتهلكنا بما فَعَلَ المُبطِلون﴾(الاعراف:١٧٢-١٧٣).

کەواتە مرۆڤ کە هێشتا لە پشتی باب و باپیرانیدا بووە، یان هێشتا لە جیهانی "ڕۆح"دا بووە و پێی نەناوەتە ناو زیندەتۆو(حيوان منوي)وە، یان هێشتا لە جیهانی گەردیلەکاندا بووە.. پەیمانی لێ وەرگیراوە. لەوانەشە ئەم پەیمانەی لە کاتی ڕۆشتنی

---

(١) سەیری سوورەتی الكهف: ٤٩، الجاثية: ٢٩، ق: ١٨، الإنفطار: ١١ - ١٢ بکە.

ئاوی مەنی بۆ ناو ڕەحم و دروستبوونی ئاوەڵمە بە فوو پێداکردنی مەلائیکەت، لێ وەرگیرابێت. واتە دەگونجێ ئەم پەیمانەی لە یەکێك لەو مەنزڵ و قۆناغانەدا لێ وەرگیرابێت کە مرۆڤیان پێدا تێ دەپەڕێت، یان لە هەموویاندا. شایەت لەسەر ئەمەش: مرۆڤ خۆیەتی.. ویجدانیەتی.

ئایەتە پیرۆزەکە بە وشەی: ﴿رَبُّكَ﴾ ئاماژە بۆ گەلێ واتا دەکات. یەکێك لەوانە بریتی‌یە لەوەی کە: ئەو کەسەی پێت دەگەیەنێت و بەرەو کەماڵ دەتداتە بەر و لە ماددەی "أثـیر" گەردیلەکانی وجوودت بەدی‌دەهێنێت و شتانی جوزئیی تۆیشی پێك‌هێناوە، ئنجا پێکهاتووەکانیشتی لێ بنیات ناوە.. ئەو کەسەی کە لە دایك: "هێلکە و گەرا" و، لە باوك: "ئاوی مەنی"ی بەدی‌هێناوە و لە ناوەندی تێپەڕبوونت بە چەندین تاریکستانی یەك لە دوای یەکدا شوێنی لەبار و گونجاوی بۆ ئامادە کردوویت، هەتا گەیاندیتیە ئەوەی بتوانیت لە ژینگەیەکی بێ هەوادا بە هەناسەی دایك هەناسە بدەیت و بە خۆراکی ئەویش خۆراکی بۆ دابین کردیت و لە ڕێی خوێنی دایکتەوە پاشەڕۆ زیادەکانی وجوودی خۆتی لە کۆڵ کردیتەوە.. ئەو کەسەی کە دوای پێ‌بڕینی چەند قۆناغێکی دیاری‌کراو بەرەو پلەی بەرزی "أعلى علیین" تۆی دایە بەر.. ئەو کەسەی کە زیندەوەرانی تری پابەندی ناو سروشتی خۆیان کرد، کەچی تۆی - بە بۆنەی "پەروەردە" و پێگەیاندنی خۆیەوە - بە چەندین پلەدا بۆ لای خۆی سەرخستووە و دڵیشتی بە ئیمان ئاوەدان کردووەتەوە، تاکو ماددە و واتا و ناوەرۆکت تەواوەتی و کەماڵ بەدەست بهێنن. ئنجا بە کردەوە چاکەکانت ڕواڵەتی دەرەوە و ناوەوەشتی ڕووناك کردووەتەوە و، بۆ ئەو ڕێگا ڕاستەش ڕێنمایی کردوویت کە دەتگەیەنێتە خزمەتی پێغەمبەری سەردارمان حەزرەتی محمد المصطفى ﷺ و، چوونە ژێر باڵی پەروەردەکەی خۆیشی بۆ دەستەبەر کردوویت و، لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە نیعمەتی ڕۆشتن و شوێن‌پێ هەڵگرتن و پەروەردەی ئەو پێغەمبەرەی ﷺ پێ بەخشیویت هەتا گەیاندوویتیە چڵەپۆپەی پلەی ویلایەت.. بەم جۆرە هەنگاو لە دوای هەنگاو پێت دەگەیەنێت و پەروەردگارێتیی خۆیت بۆ دەردەخات. جا ئەم پەروەردگار(رب)ە میهرەبانەیە کە لە سەرەتادا پەیمانی لێ وەرگرتوویت و تۆی کردووە بە شایەت لەسەر ئەوەی کە: هەر تەنها خۆی پەروەردگارە.

﴿ألستُ بربّكم﴾(الاعراف:١٧٢). ئایا شایەتی دەدەن کە هەر من پەروەردگارم و جگە لە من هیچ کەسێك نی‌یە پەروەردگاری ئەم بارودۆخ و کاروبارە تێکەڵاوانە بێت و.. غەیری من هیچ کەس نی‌یە بتوانێت لە سەرەتا و کۆتایی‌دا هاوسەنگیی ئەم ڕووداوانە

ڕابگرێت و.. جگە لە من کەسی تر نی‌یە ئەم مرۆڤە بەهەشتی‌یەی لە گڵێکی چڕ و پڕ بەدی‌هێنابێت کە تەنانەت پێشی مەلائیکەتیش دەداتەوە؟

بەو واتایەی کە ئەی گرۆی مرۆڤ! هەر لە تەوقی سەرتانەوە تا پاژنەی پێتان سەرنج بدەن و بۆی بڕوانن.. ببینن ئایا جگە لە من بەدیهێنەرێك هەیە بتوانێت لەسەر ئەم شێوەیە بەدیتان بهێنێت؟ جگە لە من کەس هەیە بتوانێت خۆی لەم کارەدا هەڵبقورتێنێت؟ غەیری من کەس دەتوانێت ئەم کەماڵی بەدیهاتنەتان پێ ببەخشێت کە لە جوانترین شێوە و ڕوخساردایە؟ ئایا سەیری ڕوخساری دەموچاوی خۆتان کردووە کە هێندە نیشانەی جوداکەرەوەی تێدا دانراوە لە ملیارەها مرۆڤی تر جیاتان بکاتەوە، لە کاتێکدا کە ئەندازەی دەموچاو لە ئەندازەی یەك لەپی دەست تێ ناپەڕێت؟ ئایا کێ دەتوانێت ئەم موعجیزانە بەدی‌بهێنێت؟ خۆ تەنانەت خەتی سەر پەنجەکانی ملیارەها کەس لە یەکتر جیایە، جا کێ دەتوانێت ئاوا لە یەکیان جیا بکاتەوە؟

بەم جۆرە، دوای ئەوەی کە خوای "پەروەردگار" ڕوونی دەکاتەوە بۆ خەڵکی کە هەر تەنها خۆی پەروەردگارە، دەچێت خۆیان دەگرێت بە شایەت لەسەر ئەم پەروەردگاری‌یە و دەفەرموێ: ﴿ألستُ بربّكم﴾؟ خۆ ئەو شتەی پرسیارەکەی ئاراستە کراوە، هەرچی‌یەك بێت: ڕۆح بێت، یان گەردیلەکان، یان مەنی، یان ئاوڵمەی ناو ڕەحمی دایك، یان ماددەی ئەثیر.. وەلاّم تەنها هەر: ﴿بلى﴾یە! واتە: بەڵێ ئەی پەروەردگار! هەر تەنها تۆی پەروەردگاری ڕاستەقینە و جگە لە تۆ کەسی تر نی‌یە پێمان بگەیەنێت و بەرەو کەماڵ بمانبات.

بەم جۆرە، ئەم شایەتی‌یە لەناو "ویجدان"دا تۆمار دەکرێت و دەنووسرێت و بە چەشنێك تیای‌دا جێگیر دەبێت کە هەرگیز نەتوانرێت بسڕێتەوە.

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ئاماژەی بۆ ئەم نووسینە کردووە لەو فەرموودەیەی‌دا کە فەرموویەتی (كُلُّ مَولودٍ يولَدُ على الفِطرة، ثُـمَّ أبـواهُ يُهَوِّدانـهِ أو يُنَصِّرانـهِ أو يُمَجِّسانِهِ)[1].

بەڵێ، هەموو کەسێك لەسەر فیطرەت لە دایك دەبێت. ویجدانی ئامادەیی تێدایە بۆ ئیمانهێنان بە خوای گەورە و، بە وێنەی لاپەڕەیەکی سپی‌یە کە هێشتا هیچ شتێکی تێدا نەنووسراوە و ئامادەی ئەوەیە کە خاوێنترین دەستەواژە، یان پارچە شیعرێکی تێدا بنووسرێت کە ژیریی مرۆڤی تێدا سەرسام ببێت. بەڵێ بەم جۆرە لە دایك دەبێت.. بەلاّم دوای ئەمە چی ڕوو دەدات؟ ئەوە ڕوو دەدات کە لە لایەن نزیکترین کەسی وەك باوك و

(١) البخاري: الجنائز ٩٣. أبو داود: السنة ١٧. الترمذي: القدر ٥.

دایك و مام و خاڵ، بەڵکو لە لایەن دوورترین کەسیشەوە، کاری تێدەکرێت و دەیکەن بە جوولەکە یان گاور یان مەجووس. خۆ گەر ئەو دەستەواژانە بەکار بهێنین کە لەم سەردەمەدا برەویان هەیە، دەڵێین: هەموو ئەوانە ئەم کەسە لەدایكبووە خاوێنە بەرەو باوەشی شیوعییەت و ماسۆنییەت و سەرمایەداری و... هتد دەدەنە بەر. واتە هێندە کاریگەرییان لەسەری دەبێت کە تەنانەت لە ئایینی خوای گەورەش دووری دەخەنەوە و بەرەو جۆرەها ڕێگای تری دەبەن و چەپەڵی دەکەن.

هەموو خاوەن فیطرەتێکی ساغ لە ویژدانی خۆیدا دەنگی ئەم شایەتی‌یە دەبیستێت لە سەر پەروەردگاریتیی خوای گەورە.. ئێمە لە یەكبەیەکی لاپەڕەکانی قەوارە و بوونی خۆماندا هەست بەم پەیمانە دەکەین. هەر لەبەر ئەمەشە کە: "ویجدان" بە یەکێك لەو چوار بناغە گشتی و سەرەکی‌یە دادەنێین کە بەدیهێنەری خۆمان پێ دەناسێنن و، هەر لە خۆیدا بە بەڵگەیەکی سەربەخۆی وەردەگرین لەسەر بوونی خوای گەورە[1].

بەڵێ "گەردوون" کتێبێکە بە خوای گەورە ئاشنامان دەکات.. بە هەمان جۆر "قورئانی پیرۆز"یش کتێبێکی ترە و خواوەندمان پێ دەناسێنێت.. "پێغەمبەر"ی خۆشەویستیشمان ﷺ بەڵگەیەکی گۆیای خاوەن گوفتارە بۆ ناسینی ئەو خواوەندە ڕێنماییمان دەکات.

جگە لەمانەش کتێبێکی تر هەیە کە دەنگی نی‌یە و هەرگیز درۆش ناکات، بەڵام لە قوڵایی ناخمانەوە دەنگی دێت - هەروەك "کانت"[2] و "بریگسۆن"[3] و فەیلەسووفەکانی تری هاوچەشنیان ناسینی خوا دەگێڕنەوە بۆ دەرەوەی کتێب و سروشت و بیرەکان - جا ئەم کتێبە بریتی‌یە لە: "ویجدان".. لەم شایەتە ڕاستگۆیەی کە هەمیشە زمانی بە وشەی: ﴿بلی﴾ تەڕ و شیرین و پاراوە و بەڵگەیەکی هێندە ڕوونە

(١) بروانە کتێبی: "ڕاستیی تەوحید یان تەوحیدی ڕاستەقینە" ل ١٦٣-١٦٦. (وەرگێڕ)

(٢) (عەمانوئیل کانت): فەیلەسووفێکی ئیمانداری ئەڵمانی‌یە. لە نێوان ساڵەکانی: (١٧٢٤-١٨٠٤ ز)دا ژیاوە. لە بواری فەلسەفەدا نووسینەکانی پێشکەش کردووە. هەستی ناوناخی مرۆڤ(وجدان)ی کردووە بە بەڵگە لەسەر بوونی خوای گەورە. بۆ زیادە شارەزابوون لە بۆچوونەکانی ئەم فەیلەسووفە لەم ڕووەوە بروانە کتێبی: (قصة الإيمان بين الفلسفة والعلم والقرآن) ل ١٦٠-١٧٤. (وەرگێڕ)

(٣) (هینری لوی بریگسۆن): فەیلەسووفێکی فەرەنسی‌یە. ساڵی (١٨٥٩ز) لە پاریس لەدایك بووە. دوای ئەوەی کە ماوەیەکی ژیانی لە بوارەکانی بیرکاری و زانستە سروشتی‌یەکاندا بەسەر بردووە ئنجا ڕووی کردووەتە بواری "فەلسەفە" و گەلێ کتێبی تێدا داناوە کە یەکێکیان ناوی: (سەرچاوەی ئایین و ئەخلاق)ە و بە دوا قۆناغی فیکریی ئەم فەیلەسووفە دادەنرێت. ساڵی (١٩٢٨ز) خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتووە. ساڵی (١٩٤١ز) کۆچی دوایی کردووە. بۆ زیادە شارەزابوون لە بۆچوونەکانی ئەم فەیلەسووفە لەم ڕووەوە بروانە کتێبی: (قصة الإيمان بين الفلسفة والعلم والقرآن) ل ١٧٤-١٨٠. (وەرگێڕ)

لەسەر خوای گەورە کە هەر کەسێك پەیی پێ بەات و لە ناخی خۆیدا هەستی پێ بکات پێویستی بە هیچ بەڵگەیەکی تر نامێنێت. سرەوتن و دڵنیایی ئەم ویجدانەش تەنها لەوەدایە کە خوای گەورە بدۆزێتەوە.

بەم جۆرە، هەموو کەسێك کە لە دایك دەبێت ئەم شایەتەی لە گەڵدایە.

لەبەر ئەوەیە کە ئێمە پێمان باشە بەم واتایە لە: "مَنْ عَرَفَ نَفسَهُ فقد عرفَ ربَّـهُ"[1] تێ بگەین. واتە هەر کەس لە زمانی ویجدانی خۆی تێ بگات، ئەوا خوای گەورەش دەناسێت و پێی ئاشنا دەبێت.

"نیازیی میسری"[2] لە شیعرێکدا بەم واتایەی خوارەوە ئەو بۆچوونەی دەربڕیوە کە تیایدا دەڵێت:

(بە سەری ڕووت و پێی پەتی لە دەشت و دەر و چۆڵایی و بیابانەکاندا تەنیا بە دوای ئەودا دەگەڕام، بەڵام کە پەردە لە نێواندا لادرا، بینیم ئەوەی من بە دوایدا عەودالم لەناو ناخی ویجدانی خۆمدا دانراوە)[3]!

ئەم بیرە بەم بەیتانەی نیازیی میسری گەیشتە چڵەپۆپە. ئەوەبوو ملیۆنەها کەس لە ئەولیایان بە ڕێنمایی ئەم کتێبە پڕ لە نهێنییەی "ویجدان" چەندین ماوەی بێ کۆتایی و یەك لە دوای یەکیان بڕی.

ئەم گۆشە مەزنەی لایەنە پەروەردگارییە ناسکەکەی ناو ناخی خۆمان، کە پێی دەڵێین "ویجدان"، هەر هێندەی بە پێناسەکەیەوە - کە هەموو گرێ کوێرەیەك دەکاتەوە

---

(١) قال ابن تيمية موضوع، و قال النووي قبله ليس بثابت وذكر بعض الأصحاب أن الشيخ محي الدين (بن عربي) قال: هذا الحديث وإن لم يصح من طريق الرواية فقد صح عندنا من طريق الكشف. وفي أدب الدين والدنيا للماوردي عن عائشة (رضي الله عنها) سئل النبي ﷺ من أعرف الناس بربه؟ قال: أعرفهم بنفسه. كشف الخفاء ٢٥٣٢.

(٢) نیازیی میسری: (١٦١٨-١٦٩٤ز) زانا و شاعیرێکی زاهیدە، لە گوندێکی سەر بە پارێزگای "مەلاتیبە"ی کوردستانی تورکیا لە دایك بووە. خوێندنی لە "ئەزهەر" تەواو کردووە، هەر لەبەر ئەوەش پێی وتراوە: "میسری". کە لە میسر گەڕاوەتەوە دەستی کردووە بە ڕێنمایی موسڵمانان لە یەکێك لە قوتابخانەکانی ئەو کاتەی ئەستەمبوڵدا، هەر لەوێش تەریقەتی "خەلوەتی"ی دامەزراندووە کە پێیشی دەوترێت: "تەریقەتی نیازی" و "تەریقەتی میسری". جگە لە "دیوانی شیعر" و "مەکتووبات"ەکەی، چەند بەرهەمێکی تری هەیە وەك: "موائد العرفان"، "عوائد الإحسان"، "هداية الإخوان". (وەرگێڕ)

(٣) هەر بەم واتایە "حافظی شیرازی"ش وتوویەتی:

سالـها دل طلبِ جـامِ جم أز مـا می کرد — آنچه خود داشت زِ بیگانه تمنا می کرد
گوهری کز صدفِ کَون و مکان بیرون بود — طلب أز گمشُـدگانِ لبِ دریا می کرد!

بروانە: (دیوان حافظ شیرازی) ص ١٠٦ چاپ: کتابفروشی إسلامیه - تهران - ١٣٢٧ هـ.ش. (وەرگێڕ)

- لە دڵماندا دەبووژێتەوە، یەکسەر دەبینین بەهەشت خۆی پێشچاو دەخات و بۆن و بەرامەکەی بەسەرماندا هەڵ دەکات بە ڕادەیەك کە هەست دەکەین و دەبینین: جیلوەی حوزووری ئیلاهیی تێدا بەرجەستە بووە. هەروەك لە هەمان کاتدا هەست بە نەفرەت دەکەین لە دۆزەخ و هەر کردارێك مرۆڤ بەرەو دۆزەخ ببات. ئەم نەفرەتەش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاد دەکات تا "ویجدان" وای لێ دێت دەبێت بە ڕابەرێك و دەستمان دەگرێت و بۆ هەموو گۆشەیەکی گەردوونمان دەبات و واتاکانی هەموو شتێکی ناو گەردوونیش دەخاتە پێش چاوەکانمان.

جا هەر مرۆڤێك کە دێتە دنیا ئەم بەڵگەیەشی لەگەڵدایە کە دەیگەیەنێتە بەرزایی و چڵەپۆپەکان. بەڵام ئەو بێئاگایەی کە نوقمی ماددە بووە و لەناو ئەزموونگەکاندا بە دوای خوای گەورەدا دەگەڕێت و گوێی خۆی لە دەنگی "ویجدان" دەئاخنێت و تەنانەت هەر ویجدانیشی ناخاتە کار، تا ئەو ویجدانەی وای لێ هاتووە کە چەپەڵ بووە و پووکاوەتەوە.. ئەو کەسە، بێ هیچ گومانێك، لە حەقیقەتی ئەم بەڵگەیە تێناگات و ناتوانێت سوودی چاوەڕوانکراوی لێ ببینێت.

ئایەتی پیرۆزی: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾ گەلێ حەدیثی پیرۆز ڕوونیان کردووەتەوە کە لە نزیکەی سی کەسی هاوەڵە بەڕێزەکانەوە ڕیوایەت کراون و، ئەم سەردارانەمان هەندێکیانن: ئیمامی عەلی و، ئەبوو سەعیدی خودری و، سوراقەی کوڕی مالیك و، حەزرەتی عائیشەی دایکمان و، عبداللّەی کوڕی زوبەیر و، عبداللّەی کوڕی عەبباس و، عبداللّەی کوڕی مەسعوود و، عبداللّەی کوڕی عەمر، خوایان لێ ڕازی بێت. وا ئەم حەدیثەیان لێ باس دەکەین:

حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب دەفەرموێ: گوێم لێ بوو لە بارەی ئەم ئایەتەوە پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا. ئەویش فەرمووی: (خوای گەورە حەزرەتی ئادەمی دروست کرد و ئنجا دەستی بەسەر پشتیدا هێنا و وەچەیەکی لێ هێنایەدەر و فەرمووی: ئەمانەم بۆ بەهەشت دروست کردووە و ئەوانیش کردەوەی ئەهلی بەهەشت دەکەن. پاشان دەستی بەسەر پشتیدا هێنا و وەچەیەکی تری لێ هێنایەدەر و فەرمووی: ئەمانەم بۆ دۆزەخ دروست کردووە و ئەوانیش کردەوەی ئەهلی دۆزەخ دەکەن)[1].

لە ڕیوایەتەکەی "ئوبەی کوڕی کەعب"دا سەبارەت بەم فەرمایشتەی خوای گەورە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ﴾... تا کۆتایی ئایەتەکە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(١) موسنەدی ئیمام ئەحمەد: ١/٢٧٢. تەفسیری "ابن كثير": ٣/٥٠٣.

(خوای گەورە نەوەی ئادەمی کۆکردووەتەوە و کردوونی بە "ڕۆح". پاشان فەزڵی دان بەسەر بەدیهاتووانی تردا و ئنجا خستنیە گوفتار و ئەوانیش قسەیان کرد، پاشان عەهد و پەیمانی لێ وەرگرتن و خۆیانی کرد بە شایەت لەسەر خۆیان سەبارەت بە پەروەردگاریێتیی خواوەند و فەرمووی: ﴿ألستُ بربّكم﴾ ئەوانیش لە وەڵامدا وتیان: ﴿بلى﴾.. تا کۆتایی فەرموودەکە[1].

٦) فەرموودەیەکی تر هەیە یەکێك لە هاوەڵە مەزنەکان ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(الشقيُّ مَن شَقِيَ في بطنِ أمِّهِ، والسَّعيدُ مَنْ سَعِدَ في بطنِها)[2].

بەڵێ، "مارکس" شەیتانێکە لەسەر شێوەی ئادەمیزاددا و، مرۆڤایەتی لە ڕێ دەردەکات. بۆیە هەر کە لە سکی دایکیدا بووە، مۆری شەقاوەت و بەدبەختیی لەسەر دراوە..

ڕابەرەکانی سەدەی بیستەمیش وەك: "حەسەن بەننا"[3] و "سەیید قوتب"[4] و ئەو

---

(١) الفتح الرباني في ترتيب مسند الإمام أحمد بن حنبل الشيباني لأحمد عبدالرحمن البنا ١٤٦/١٨.

(٢) رواه الهيثمي في مجمع الزوائد ١٩٣/٧ و رواه البزار و الطبراني في الصغير. و رجال البزار رجال الصحيح. (واتە: بەدبەخت ئەو کەسەیە کە لە سکی دایکیدا بەدبەخت بووە و، بەختەوەریش ئەو کەسەیە کە لە سکی دایکیدا بەختەوەر بووە).

(٣) (حسن البنا): یەکێکە لە کەسایەتییە ناودارەکانی بانگەوازی ئیسلام لەم چەرخەدا. کوڕی زانای موحەددیثی میسری: (أحمد عبدالرحمن البنا)یە، لە ساڵی ١٩٠٦ز لە دایك بووە. کۆلیجی (دار العلوم)ی قاهیرەی تەواو کردووە. ساڵی ١٩٢٨ز لە شاری ئیسماعیلیە کۆمەڵی (برایانی موسڵمان)ی دامەزراندووە و پاشان لە قاهیرە و شارەکانی تری میسردا چەندین لقی تری بۆ ئەو کۆمەڵە کردووەتەوە. ساڵی ١٩٤٨ز خۆی و کۆمەڵەکەی لە جەنگی فەلەستیندا بەشداریی جیهادی جوولەکەیان کردووە. ساڵی دوای ئەوە لە ١٢/٢/١٩٤٩زدا لە لایەن دەستێکی پەنهانەوە شەهید کرا. لە وڵاتە عەرەبییەکان و چەندین شوێنی تری جیهاندا بانگەوازەکەی بڵاوبووەتەوە و ڕۆڵێکی لەبەرچاوی بووە لەم ڕابوونە ئیسلامییەی ئێستای جیهاندا، جگە لەمەش چەند کتێب و نامیلکەیەکی دوای خۆی بەجێهێشتووە کە بەناوبانگترینیان یادداشتنامەیەکە بە ناوی: (مذكرات الدعوة والداعية). (وەرگێڕ).

(٤) (سەیید قوطب): ئەدیب و نووسەر و کەسایەتییەکی ئیسلامیی ناوداری میسرییە. ساڵی ١٩٠٦ز لە یەکێك لە گوندەکانی پارێزگای ئەسیووط لە دایك بووە. کۆلیجی (دار العلوم) تەواو کردووە. لە پێشدا لە لایەن دەوڵەتەوە بایەخێکی زۆری پێ دراوە، بەڵام کە لە ساڵی ١٩٥١ز پەیوەندیی بە کۆمەڵی (برایانی موسڵمان)ەوە کرد هەڵوێستی دەوڵەت بەرامبەری گۆڕا و چەند جارێك دووچاری گرتن و ئەشکەنجەی ناو بەندیخانەکانی ئەو سەردەمەی میسر کرا، هەتا لە بەرواری ٢٨/٨/١٩٦٦زدا فەرمانی لەسێدارەدانی دەرکرا و شەوی دوای ئەوە لە سێدارە درا. گەلێ بەرهەمی دوای خۆی بەجێهێشتووە، بەناوبانگترینیان تەفسیرێکە بە

ڕابەرەش کە بەناو "سەعید"ە و بە نازناو و کۆمەڵەکەشی لە تورکیادا ڕابەرێکی تابلێی. مەزنە[1] و، هاوچەشنە زۆرەکانی تری ئەمانە، هەر هەموویان، کە هێشتا لە سکی دایکیاندا بوون، بە مۆری سەعادەت و بەختەوەری شەرەفمەند بوون.

بەڵێ، بەختەوەر و بەدبەخت ئەوانەن کە هێشتا لە سکی دایکیاندا بوون: "بەختەوەر" یان "بەدبەخت" بوون. بەڵام ئەم نووسینە پێش وەختەی چارەنووسیان "ویست"ی مرۆڤی تێدا ڕەچاو کراوە، چ لایەنی ڕق و ئینکاری ئەو مرۆڤە بێت، چ سۆز و مەردایەتیی ئەو بێت.

٧) لە فەرموودەیەکی پێغەمبەری خۆشەویستدا ﷺ کە هەر دوو ئیمامی بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە، ئەو گفتوگۆیە باس کراوە کە لە نێوان حەزرەتی ئادەم و حەزرەتی مووسادا - علیهما السلام - ڕووی داوە و، ئەو چارەنووسە پێشوەختە ڕوون دەکاتەوە کە ئێمە خەریکین باسی دەکەین:

"طاووس" - کە زانایەکی دوای سەردەمی هاوەڵەکانە - دەڵێت: لە ئەبوو هورەیرەم بیست کە دەیوت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (گفتوگۆیەك لە نێوان ئادەم و موووسادا ڕووی دا. موووسا پێیوت: ئەی ئادەم! تۆ باوکمانی کەچی نائومێدت کردین و لە بەهەشت بەدەرتناین! ئادەم پێیوت: ئەی موووسا! خوای گەورە بە گفتوگۆ

ناوی: (في ظلال القرآن) و کتێبێکە بە ناوی (معالم في الطريـــق). گەلێ کتێب و لێکۆڵینەوە و بڕوانامەی زانکۆییش لە بارەی لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانیەوە نووسراوە، فراوانترینیان تا ئێستا کتێبێکە بە ناوی: (سيد قطب من الميلاد إلى الإستشهاد) نووسینی: دکتۆر صلاح الخالدي. (وەرگێڕ).

(١) مەبەست زانای گەورەی کورد: بديع الزمان مامۆستا سەعیدی نوورسییە، کە لە گوندی (نوورس)ی سەر بە پارێزگای (بەدلیس)ی کوردستانی تورکیا لە دایك بووە و، لە نێوان ساڵەکانی (١٨٧٦-١٩٦٠ز)دا ژیاوە. گەورەترین زانایە کە لە دوای مەولانا خالیدی نەقشبەندی لەناو نەتەوەی کورددا هاتووەتە دنیاوە و، یەکێکە لە کەسایەتییە جیهانییە گەورەکانی بانگەوازی ئیسلام لەم چەرخەدا. ئەو پیلانەی کە دوژمنان بۆ سڕینەوەی ئیسلام لە وڵاتی تورکیادا دایانڕشتبوو ئەم زانایە توانیی ڕووبەڕووی بێتەوە و، خۆی و قوتابییانی (قوتابییانی نوور) بوون بە بەردی بناغەی بووژانەوەی بانگەوازی ئیسلام و، هەموو زەبر و زەنگێکی مستەفا کەمال و دام و دەزگا چەوسێنەرەکانی و سیوپێنج ساڵی بەندی و زیندانی تاکە کەسی و ڕەهەندەیی و دەستبەسەری و دەیان دادگای تۆقێنەر نەیانتوانی چۆکی پێ دابدەن. تەنانەت توانیی بانگەوازی ئیسلام بگەیەنێتە ئاستێکی ئەوتۆ کە پیلانی دوژمنان پووچەڵ بکاتەوە. زیاتر لە سەدوسی کتێب و نامیلکەی دوای خۆی بەجێهێشتووە، کە بە زۆربەی زمانە زیندووەکانی جیهان - کە یەکێکیان زمانی کوردییە - بڵاو بوونەتەوە. تا ئێستا زیاتر لە شەش کۆنگرەی جیهانی و دەیان کۆڕی زانستی و پێشبڕکێی ڕۆشنبیری لە ئاستی جیهاندا لەسەر کراوە و دەیان کتێب و سەدان لێکۆڵینەوەی لەسەر نووسراوە و چەندین بەڵگەنامەی زانکۆییشی لە خوێندنی باڵادا لەسەر وەرگیراوە. (وەرگێڕ)

لەگەڵکردنی خۆی پلەوپایەی تۆی لە پێغەمبەرانی تر جیا کردەوە و هەڵی بژاردیت و بە دەستی خۆی هێلی بۆ کێشایت، ئایا لەسەر شتێك لۆمەم دەکەیت کە چل ساڵ پێش ئەوەی خواوەند دروستم بکات تەقدیری کردبوو بیهێنێتە ڕێم؟ بەم جۆرە حەزرەتی ئادەم لە مووسای بردەوە)[1].

هەر لە کۆنەوە پێشینانمان ئەم وتوویژەیان ڕوون کردووەتەوە. وا لێرەدا قسەکانیان بە پوختی دەهێنین:

● بۆیە ئادەم مووسای بەزاند چونکە باوکیەتی.

● حەزرەتی ئادەم و مووسا هەریەکەیان خاوەنی شەریعەتێکن کە تایبەتە بە خۆیەوە، لەوانەیە شتێك لە شەریعەتی یەکێکیاندا بە گوناهـ دابنرێت، بەڵام لە شەریعەتی ئەوی تریاندا گوناهـ نەبێت. لەبەر ئەمە ئادەم مووسای بەزاند.

● بەهەشت خانەی تەکلیف نییە وەکو دنیا، کەواتە ئادەم لە بەهەشتدا هیچ تەکلیفێکی لە ئەستۆدا نەبووە. کەچی مووسا بەپێی دەستوورێك وتوویژی لەگەڵ ئادەمدا کردووە کە تایبەتە بە خانەی دنیاوە. بۆیە بەڵگەکەی حەزرەتی ئادەم پەسەند کرا.

● حەزرەتی ئادەم ویستی مووسا تێبگەیەنێت کە خێر و شەڕ هەردووکیان لە لای خواوەندەوەیە. کە دیارە ئەم هەڵوێستەی ئادەم ڕاستە، بۆیە مووسای بەزاند.

جگە لەمانەش گەلێ ڕاڤە و ڕوونکردنەوەی تر لەسەر ئەم فەرموودەیە هەیە[2].

ئێمە لەبەر ڕێزگرتنمان لە زانایانی سەلەف موناقەشەی ئەم بۆچوونانە ناکەین کە لە شەرحی ئەم فەرموودە پیرۆزە ناوبراوانەدا وتوویانە، ئەمە جگە لەوەی کە ئەم چەشنە تەوجیهات و بۆچوونانە لەو جۆرە شتانە نین کە بتوانرێت کێشانە و پێوانە بکرێن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نامانەوێت هەروا ئەم باسە بەجێبهێڵین بێ ئەوەی ئاماژە بۆ حیکمەتێکی ورد بکەین کە تیایدایە. چونکە فەرموودەکە مەسەلەیەکی ورد و پەنهانی قەدەرمان تێدەگەیەنێت کە بریتییە لە: (سَبَق الكتــاب) واتە هەموو شتێك لە پێش پەیدابوونیدا نووسراوە. ئەم فەرموودەیە بەراوردی نێوان بەڵگەکانی حەزرەتی ئادەم و مووسا دەکات، پاشان پێغەمبەر ﷺ لە ئەنجامی بەراوردەکەدا سێ جار فەرمووی: "ئادەم لە مووسای بردەوە". بەڵام نەیفەرموو: قسەکەی مووسا هەڵەیە. تاکو سەرنج بۆ شموولییەتی بەڵگەکەی حەزرەتی ئادەم ڕابکێشێت.

---

(١) رواه البخاري: التفسير ٢٠، القدر ١١، الأنبياء ٣١، التوحيد٣٧. و رواه مسلم: القدر ١٣.

(٢) بڕوانە: شرح مسلم للنووي ١٦/ ٤٤٠-٤٤٢.

لە ڕاستیدا قەدەر دوو ڕووی هەیە:

**یەکەمیان:**

ڕووی تەقدیر و دەستنیشانکردنی هەموو شتێك لە لایەن خوای گەورەوە بە زانستی هەمەلایەنگری خۆی. واتە ئەو ڕووەی کە لە خوای گەورەیە.

**دووهەمیان:**

ئەو ڕووەی قەدەر کە پەیوەندیی بە ویستی مرۆڤەوە هەیە.

جا حەزرەتی مووسا - درودی لەسەر بێت - کاتێ کردنەدەرەوەی حەزرەتی ئادەمی لە بەهەشت لێكدایەوە تەنها ئەو ڕووەی قەدەری خوێندەوە کە پەیوەندیی بە ویستی مرۆڤەوە هەیە. بەڵام حەزرەتی ئادەم لە هەردوو ڕووەکەوە ڕوانییە قەدەر، واتە ڕووی "تەقدیری خواوەند" و ڕووی "ویستی مرۆڤ". واتە لە مەقامی ڕەچاوکردنی هەردوو ڕووەکەوە لەگەڵ حەزرەتی مووسادا وتوویژی کرد. جا لەبەر ئەوەی ڕوانگەی ڕوانینەکەی ئەو فراوانتر بوو ئەوا لە حەزرەتی مووسای بردەوە.

هەرچەند ویستی مرۆڤ خاوەنی بوونی دەرەکی(وجوودی خاریجی) نییە، کەچی هەرچی خراپە و گوناهباری دەکرێت دەخرێتە ئەستۆیەوە، چونکە ئەو ویستە مەرجێکە لە بەدیهێنانی ئەو کردەوانەدا لە لایەن خوای گەورەوە.

ئەم ئایەتە پیرۆزە تەرازوویەکمان بۆ ئەمە دەداتێ کە دەفەرموێ:

﴿مَا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللهِ وَمَا أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِنْ نَفْسِكَ﴾(النساء:٧٩)..

بەڵام لایەنێکی تر لە مەسەلەکەدا هەیە، کە بریتییە لە "مەشیئەتی خوایی" واتە: ویستی خوای گەورە، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕایدەگەیەنێت:

﴿وَمَا تَشَاؤُونَ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللهُ﴾(الإنسان:٣٠).

بەڵێ، خوای گەورە خاوەنی حیکمەتی ڕەهایە و فەرمان و ویستی خۆی لە سەرووی هەموو ویستەکانی ترەوە ڕایی دەکات. خۆ ئەوەش کە ناوی "ویستی مرۆڤ"تان لێ ناوە لە ڕاستیدا وەکو دڵۆپێکی بچووك وایە کە ئەگەر تێکەڵ بە دەریایەکی پڕ و گەورە بکرێت ماهییەتەکەی دەرناکەوێت، چونکە خۆی لە خۆیدا هەر هیچ نییە، بەڵام خوای گەورە ئەم جیهانەی لەسەر ئەم ویستە هیچە بنیات ناوە. تا لێرەوەیە کە ویستی هیچی مرۆڤ گرنگییەکی مەزنی بە ئەندازەی جیهانی بەدەست هێناوە.

لەبەر ئەمە، دەبێ بەم شموولییەتە بڕوانینە "قەدەر" کە ڕوانینی "مەقامی جەمع"ە لە نێوان هەردوو ئایەتەکەدا. خۆ ئەم ئایەتە پیرۆزانەی خوارەوە ئەم مەسەلەیەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە:

﴿كَلاَّ إِنَّهُ تَذْكِرَة ۞ فَمَنْ شَاءَ ذَكَرَهُ ۞ وَمَا يَذْكُرُونَ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللّٰهُ هوَ أَهلُ التَّقْـوَى وأهلُ المَغفِرَة﴾(المدثر:٥٤-٥٦).

کاتێ کە بە ئیمـامی غـەزالی وتـرا: ئێمـە کـردەوە ناکـەین بـەڵکو ئیرادە دەکـەین، لـە وەڵامدا فەرمووی: ئەی ئایا کێ ئەو ویست و ئیرادەیەی بە ئێوە دا؟

بێ گومان ئێمە تەکلیفمان لە ئەستۆدایە و، کاتێ کـە کردەوەکانمـان ئـەنجام دەدەیـن وەك ئەوە وایە خۆمان بکەری کردەوەکان بین! بـەڵام سنوور و حەقیقـەتی ئـەم تەکلیفـە مەگەر ئەو کەسەی لە ئەستۆی نـاوین دەنـا کـەس بـە تـەواوی نـایزانێت. ئـەوەتا شـتێکی ئەوتۆی بە ئێمە داوە کە دەگونجێ ببێت بە سەرچاوەی "خـێر" یـان سـەرچاوەی "شـەڕ". کەواتە بـە تـەواوەتی نـازانین ئـەم شـتەی کـە بـە ئێمـەی داوە ڕووی دەرەوەیـە یـان دیـوی ناوەوەیە. بەڵام دەبینین باشترین کوتاڵی لـێ دەچنرێت و هـەر کەسێکیش جلـەوی ئـەو شتە بگرێتە دەست، تاجی شاهانەی لەسەر دەکرێت. کەواتە ئەم شتە لـە ڕوویەکـەوە بـە هیچ دانانرێت و لە لایەکی تریشەوە بە شتێکی زۆر دادەنرێت. ئەمـەش "مـەقامی جـەمع" داخوازیەتی کاتێ دەڕوانرێتە ئەم مەسـەلەیە. جـا هەر کـەس لـە هـەردوو ڕووەکـەوە لێـی بدوێت ئەوا مەسەلەی قەدەری کۆکردووەتەوە. بەڵام ئەوانەی بەم جۆرە لێـی نـەدواون، بوون بە "ئەهلی جەبر" یان "موعتەزیلە".

بەڵێ، "کیتاب"ێك پێش وەخت نووسراوە. بەڵام لە تەنیشتی ئەم کتێبەی کە بـە لای ئێمەوە نەزانراوە، کتێبێکی تر هەیە بە گەردنماندا هەڵواسراوە. چۆنێتیەکەی ئەویش – بە هەمان جۆر – سەبارەت بە ئێمەوە نەزانراوە.

بەدیهێنەری "خێر" و "شەڕ" هەر خوای گەورەیـە. بـەڵام بـە "شـەڕ" ڕازی نیـیە و بـە "خێر" ڕازیـیە. جـا ئـەو کەسـەی ویسـتی لەسـەر کـرداری شـەڕە، مرۆڤەکـە خۆیـەتی. کەچی خوای گەورە نایەوێت مرۆڤ کردەوەی شەڕ بکات، بەڵام کاتێ مرۆڤ ویسـتی لەسەر کردەوەی شەڕ دەبێت ئەوا خوای گەورە بۆی بەدیدەهێنێت.

٨) با چەند نموونەیەکی تر بهێنینەوە تاکو ئەم مەسەلەیە زیاتر ڕوون ببێتەوە:

کاتێ ئەم ئایەتە پیرۆزە نازڵ بوو:

﴿إِنَّكُم وَمَا تَعبُدونَ مِن دُونِ اللهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَارِدُونَ﴾(الانبياء:٩٨).

بتپەرستەکان سەریان لێ شێوا و گرفتاری سەرسامی بوون! چونکە ئایەتەکـە ڕوو دەکاتە ئـەوان و دەفـەرموێ: خۆتـان و ئـەو بتانـەی کـە بـە خواکـانی خۆتـانی دادەنێـن و دەیانپەرستن و هـەموو ئـەو پاڵـەوانێتی و شـانازییانەش کـە دەیاندەنـە پـاڵ ئـەو بتانـە و

سەركەوتن و دەستكەوتەكانیان بۆ دەگێڕنەوە.. واتە: هەر شتێك كە جگە لە خوای گەورە ئێوە دەیانپەرستن.. هەر هەموویان، تەختە و سووتەمەنیی دۆزەخن!

ئەم ئایەتە یەكەم جار و ڕاستەوخۆ ڕووی لەو بتانەیە كە ناو كەعبەی پیرۆزیان لێ پڕ كرابوو كە ژمارەیان گەیشتبووە سێ‌سەدو شەست بت! جا ئەم ئایەتە هەڕەشەی ئاگری دۆزەخ لەو بتانە دەكات كە مایەی شانازی و سەربەرزیی بتپەرستان بووە. خۆ بێ‌گومان دەبوو بەرامبەر بەم هەڕەشەیە بە بێ‌دەنگی دانەنیشتنایە و شتێكیان ڕووبەڕووی ئەم تەحەددییە ئاشكرایە بوتایە. بەڵام هیچ چارەیەكیان بە دەستەوە نەبوو، چونكە توانای بەرەنگاربوونەوەی ئەم ئایەتەیان لە خۆیاندا شك نەدەبرد.

پاشان "عەبدالله‌ی كوڕی زەبەعری"یان[1] كەوتەوە یاد كە لە ڕادەبەدەر توانای گوفتار و قەناعەت پێ‌كردنی تێدابوو. ڕۆشتن بۆ لای و جەختیان لێ كرد كە پێغەمبەریان ﷺ بۆ بێ‌دەنگ بكات و پێیان‌وت: شەرەف و سەربەرزیی ئێمە لە دەستی تۆدایە! ئەوە بوو بە گوێی كردن و بیری كردەوە لەوەی كە بە یارییەكی مەنتیقی بكەوێتە گفت‌وگۆ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ. پێی‌وت:

- تۆ پێت‌وایە كە خوا ئەم ئایەتەی بۆ نازڵ كردوویت: ﴿إِنَّكُم وَمَا تَعبُدونَ مِن دُونِ الله حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنْتُمْ لَهَا وَارِدُونَ﴾. خۆ مانگ و خۆر و مەلائیكەت و عوزەیر و عیسای كوڕی مەریەمیش لە لایەن خەڵكانێكەوە پەرستراون، ئایا هەموو ئەوانەش لەگەڵ بتەكانی ئێمەدا دەخرێنە ناو دۆزەخەوە؟

یەكسەر ئەم ئایەتە پیرۆزە نازڵ بوو كە دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الذينَ سَبَقَتْ لَهُم مِنا الحسنى أُولَئِكَ عنها مُبعَدُونَ﴾(الانبياء: ١٠١)[2]!

بەڵێ، ئەوانەی كە چمكی بەرگ و پۆشاكەكانیان تۆزی دنیای لێ نەنیشتووە، دوورن لە دۆزەخەوە.. ئەو مەلائیكەتانەی كە بۆ ماوەی چاوتروو كاندنێكیش لە خوای خۆیان غافڵ و بێ‌ئاگا نابن، دوورن لە دۆزەخەوە.. حەزرەتی مەسیحیش - علیه السلام - كە گیان و وشەی خوای گەورەیە و فووی ژیانی بە مرۆڤایەتی‌دا كردووە و دڵە مردووەكانی زیندوو كردووەتەوە و، حەزرەتی عوزەیریش - علیه السلام - كە

(١) عەبدالله‌ی كوڕی زەبەعری دوایی موسڵمان بووە و بە یەكێك لە شاعیرە موسڵمانە بەناوبانگەكان دادەنرێت و، شیعرێكیشی بۆ عوزر هێناوەوە و سڕینەوەی ئەو كارەی پێشووی هۆنیوەتەوە. بڕوانە: (ابن كثیر ٥/٣٧٦). (وەرگێڕ)

(٢) (تفسیر ابن كثیر) ٥/٣٧٤-٣٧٥.

پێغەمبەرێکی مەزنە، هەردووکیان، بە ئەندازەی دووریی ئەزەل لە ئەبەدەوە، لە دۆزەخەوە دوورن. جا ئەو کەسانەی کە هەڵگری بیر و باوەڕی چەوت و هەڵەن، ئەنجامی ئەو هەڵەیەیان بە چاوی خۆیان دەبینن. بەڵام پێغەمبەران و مەلائیکەتان - علیهم السلام - وەك ئەوان نین، چونکە پێشتر بە "حوسنا" کتێبەکەیان بۆ پڕ کراوەتەوە. جا ئەوەی کە پەیوەندیی بە باسەکەی خۆمانەوە هەیە ئەم تەعبیرە قورئانییەیە: "السبق بالحسنى".

٩) حەزرەتی عبدالرحمنی کوڕی عەوف - خوای لێ ڕازی بێت - دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: کاتێ کە وەنەوز گرتبوومی و ئاگام لە لای خۆم نەمابوو، دوو کەسی سامناك لە بەردەممدا ڕاوەستان و بەرەو شوێنێك منیان دایەبەر، وتم: بۆ کوێم دەبەن؟ وتیان: (بۆلای عەزیزی ئەمین.. بۆ حساب)! کتوپڕ پیاوێك پەیدا بوو لەو دوانەی پرسی: ئەم پیاوە - کە مەبەستی من بوو - بۆ کوێ دەبەن؟ ئەوانیش هەمان وەلامیان دایەوە و وتیان: (بۆ لای عەزیزی ئەمین). پیاوەکە وتی: نەخێر نابێت بیبەن، چونکە ئەو کە هێشتا لە سکی دایکیدا بووە "سەبقی حوسنا"ی بۆ نووسراوە. پاش ئەمە بێدار بوومەوە.

ئەم فەرمودە پیرۆزەی خوارەوە - کە هەوڵ دەدەین بە درێژی ڕوونی بکەینەوە - ئەو ڕووداوەی پێشوو ڕوون دەکاتەوە.

فەرموودەکەش بریتییە لەمە:

(بە خوا هی واتان تێدایە - لە ڕیوایەتێکدا: پیاوی وا هەیە - کردەوەکانی هی ئەهلی دۆزەخن تا هێندەی باڵێك "گەزێك"ی دەمێنێت بو دۆزەخ، بەڵام کیتابەکەی پێشتر بە ئەهلی بەهەشتی نووسیوە و ئەمیش لە ئەنجامدا کردەوەی ئەهلی بەهەشت دەکات و دەڕواتە ناویەوە. پیاوی واش هەیە کردەوەی ئەهلی بەهەشت دەکات تا هێندەی باڵێك یان دوو باڵی دەمێنێت پێی بگات، کەچی کیتابەکەی پێشتر بە ئەهلی دۆزەخی نووسیوە، دەبینیت لە ئەنجامدا کردەوەی ئەهلی دۆزەخ دەکات و دەچێتە ناویەوە)[1].

ئاشکرایە کە حەزرەتی عبدالرحمنی کوڕی عەوف یەکێکە لەو دە کەسەی کە مژدەی بەهەشتیان دراوەتێ. ئەوەش کە مەبەستمانە لەو ڕووداوەدا نووسینی پێش وەختی کیتابەکەیەتی (سبق الکتاب).

---

(١) رواه البخاري: القدر ١. ومسلم: القدر ١.

١٠) عامری كوڕی سەعدی كوڕی ئەبو وەققاص ئەم ڕووداوەمان لە باوكیەوە بۆ دەگێڕێتەوە:

جارێكیان سەعد - خوای لێ ڕازی بێت - بە ڕێدا دەڕۆیشت، گوێی لێ بوو پیاوێك جوێنی بە حەزرەتی عەلی و تەلحە و زوبەیر دەدا - خوا لە هەموویان ڕازی بێت - سەعد پێی فەرموو: تۆ جنێو بە كەسانێك دەدەیت كە پێشتر لە لایەن خواوەندەوە ئەوەیان بۆ نووسرابوو كە خۆی بۆی نووسیبوون. دەسا بەخوا یان واز لە جنێوپێدانیان دەهێنیت یان دوعات لێ دەكەم. پیاوەكە وتی "بڕوانە! دەمترسێنێت.. دەڵێی پێغەمبەرە"! حەزرەتی سەعدیش فەرمووی: خوایە گیان! ئەگەر ئەم پیاوە جنێو بە كەسانێك دەدات كە لە لایەن تۆوە پێشوەخت ئەوەیان بۆ نووسراوە كە خۆت بۆت نووسیون، هەر ئەمڕۆ پێی بنوێنە و بیكە بە پەند و عیبرەت. ئەمەی وت و ڕۆشت. یەكسەر حوشترێكی مێینە خۆی كرد بە ناو خەڵكەكەدا و ئەوانیش ڕێیان بۆ چۆڵ كرد و ڕۆشت ئەو پیاوەی شێلا و دایە بەر لەقە. چاوم لێ بوو خەڵكی بە دوای سەعددا ڕایان كرد و وتیان: ئەی ئەبوو ئیسحاق! خوای گەورە دوعاكەی گیرا كردیت[1].

بەڵێ، ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی پێغەمبەر ﷺ لە لایەن خوای گەورەوە بە "حوسنا" كیتابی پێشوەختیان نووسرابوو. چونكە حەزرەتی عەلیی سەردارمان: حەیدەری كەڕڕار و، ڕیش سپیی كەڵە مەردان و، زاوای پێغەمبەری خۆشەویستە ﷺ كە گەلێ سەنا و ستایشی جوانی لە بارەوە فەرمووە..

حەزرەتی تەلحەش ئەو مرۆڤەیە كە: لە جەنگی ئوحوددا بە دەستی شكاوەوە بەرگریی لە پێغەمبەر ﷺ دەكرد و، شەرەفمەندی ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر بوو ﷺ كە دەفەرموێ: (فریای تەلحە بكەون)[2]..

حەزرەتی زوبەیریش پێغەمبەر ﷺ بە "حەواری"ی خۆی وەسفی كردووە و فەرموویەتی: (هەموو پێغەمبەرێك حەوارییەكی هەیە، حەواریی منیش زوبەیرە)[3].

سەعدی كوڕی ئەبو وەققاصیش، كە بیستنی ئەو گوفتارە نابەجێیەی پێ قبووڵ نەكرا سەبارەت بەو هاوەڵە خاوێن و بەرزانەوە، خاڵۆزای پێغەمبەرە ﷺ و لە جەنگی ئوحودیشدا بەرگریی لێ كردووە و پێغەمبەر ﷺ لە بارەیەوە فەرموویەتی: (إرمِ فداك

---

(١) أخرجه الطبراني وقال الهيثمي رجاله رجال الصحيح. بڕوانە: حياة الصحابة للكاندهلوي ٢/٤٦٩.

(٢) البداية والنهاية لابن كثير ٤/٣٣-٣٤.

(٣) رواه البخاري: الجهاد ٤٠، ٤١، ١٣٥، فضائل الصحابة ١٣، المغازي ٢٩. ومسلم: فضائل الصحابة ٤٨.

أبي وأمي)[1]. هەروەها فەرموویەتی: (خوایە! هەر کاتێ سەعد لێت پاڕایەوە دوعاکەی گیرا بکە)[2]. هەر لەبەر ئەوەش بووە کە خەڵکی دەترسان سەعد دوعایان لێ بکات..

هەموو ئەوانە لە لایەن خواوەندەوە، پێشوەخت، بە باشی کۆتایی بە کردەوەکانیان هێنراوە. واتە: "سبقت لهم من الله الحسنى". بەو واتایەی کە لە دەرگای میهرەبانی‌یەوە و بە لوتفی خواوەند و بێ ئیزن وەرگرتن دەڕۆنە ناو بەهەشتەوە.

زووتر وتمان خوای گەورە بەپێی زانستی ئەزەلیی خۆی موقەددەرات و کردەوەکانی بەندەکانی خۆی نووسیوە. جا ئەوانەش کە "سبقت لهم من الله الحسنى"ن، لەوانە جیا نابنەوە. چونکە خوای گەورە بەو زانستە ئەزەلی‌یەی خۆی دەزانێت کە ئەوانە بە ویستی خۆیان چ کردارێك دەکەن، چاك بێت یان خراپ. ئیتر خواوەند ئەو چەشنە عاقیبەتەی بۆ تەقدیر کردوون. ئەمەش کارێکی سەیر نی‌یە، چونکە خوای گەورە زانای پەنهانەکان و شتانی ئاشکرا و نادیارە، تەنانەت زانیاریی خوا هەموو شتێك دەگرێتەوە لە پێش و لە دوای دروستبوونیشی، ئەم زانینەشی لە تۆماری "قەدەر"دا دەردەخات. پاشان بەندەکەی بەپێی ئەو نووسراوە ڕەفتار دەکات کە لە کتێبەکەی‌دا نووسراوە، ئنجا مەلائیکەتان ئەو کردەوانە دەنووسن کە مرۆڤەکە دەیانکات. دوای ئەوە هەردوو تۆمارەکە پێکەوە دەردەکەون و وەکو یەك دەردەچن.

اللهم الحقنا بالذين سبقت لهم منك الحسنى.. آمين.

* * *

(١) رواه البخاري: الجهاد ٨٠. ومسلم: فضائل الصحابة ٤١، ٤٢.

(٢) رواه الترمذي، المناقب ٢٦.

## بەشی دووهەم

# پەیوەندیی "قەزا" بە "قەدەر"ەوە

"قەزا" و "قەدەر" چەند لایەنێکی جیاجیایان هەیە، بەڵام دەتوانرێت لە چوار کۆمەڵدا ئەو لایەنانە کۆبکرێنەوە:

١ – قەزا و قەدەر لە ڕووی زانستی خواوەندەوە.

٢ – قەزا و قەدەر لەو ڕووەوە کە خوای گەورە هەموو شتێك دەنووسێت.

٣ – قەزا و قەدەر لە ڕووی ویستی خواوەندەوە.

٤ – قەزا و قەدەر لە ڕووی بەدیهێنانەوە.

گەلێ مەسەلە و بابەتی زۆر هەن کە تێهەڵکێشی یەکترین و دەچنە ژێر یەکێك لەم چوار بناغەیەوە، بەڵام بۆ ئەوەی لە درێژەداندا بە باسی شتانی جوزئی نوقم نەبین، ئەوا وەك بابەتێکی سەربەخۆ لێیان نادوێین.

وا ئێستا، بە جیاجیا و یەك لە دوای یەك، درێژە بەم چوار بناغەیە دەدەین:

### ١ – قەزا و قەدەر لە ڕووی "زانست"ی خواوەندەوە.

حەز دەکەم ئەم باسە بە فەرموودەیەکی پیرۆز دەست پێ بکەم کە زووتر باسمان کردووە و بریتی‌یە لەمەی خوارەوە: "ما منكم من أحدٍ ما من نفسٍ منفوسة، إلاّ وقــد كتبَ اللهُ مكانـــها في الجنة والنـــار"[1]. بەو واتایەی کە خوای گەورە پێش ئەوەی مرۆڤ دروست بکات شوێنی ئەو مرۆڤە دەزانێت لە بەهەشت یان لە دۆزەخدا.

دەبا لە ڕووی زانستی ئەزەلیی خواوەندەوە درێژە بە باسی قەزا و قەدەر بدەین:

خوای گەورە زانایە بە هەموو شتێك؛ هەرچی شت هەیە بەپێی زانستەکەی خۆی تەقدیر و دەست‌نیشانی دەکات. هەندێ مەسەلەی ئەوتۆش هەیە کە بە فەزڵ و چاکەکاریی خۆی بە ئێمەی دەبەخشێت و قەزا و حوکم و فەرمانی خۆیمان لەسەر جێبەجێ دەکات و، بە تایبەتی تەکلیفی قورئانی پیرۆزمان دەخاتە ئەستۆ. بەڵام دەروونەکانی ئێمە زۆربەی ئەو مەسەلانەیان پێ خۆش نی‌یە و حەزیان لێ ناکەن، کەچی خوای گەورە و زانا و ئاگادار بە هەموو شتێك هیچ فەرمان و بڕیارێکمان بۆ دەرناکات گەر چەندەها دانست و سوود و بەرژەوەندی‌یان بۆ ئێمە تێدا نەبێت. واتە

---

(١) رواه مسلم: القدر ٧.

هەموو ئەو شتانەی کە خوای گەورە تەقدیر و دەستنیشانیان دەکات ئەم سوود و بەرژەوەندییانەیان تێدا ڕەچاو کراوە، بەڵام ئێمە ئاگامان لە هیچ کامیان نییە، چونکە ئێمە "نەزان" و خوای گەورەش "زانا"یە بە هەموو شتێك. "زانست"ی خوای گەورە سەبارەت بە هەر شتێك هاودەمە لەگەڵ "دانست"ەکەشی لەو شتەدا، واتە "زانایی" و "دانایی" دوو شتن هەرگیز لە یەکتر جیا نابنەوە، حیکمەت و بەرژەوەندییەکان هەمیشە شوێنکەوتەی زانستی خواوەندن. ئەوەندە هەیە خوای گەورە ناچار نییە کە هەر شتێك دەکات بەپێی حیکمەت و بەرژەوەندییەکان ئەنجامیان بدات، بەڵام هەروەك زانستەکەی دەوراندەوری هەموو شتێکی داوە، دانستەکەشی هەموو شتێکی گرتووەتەوە. واتە: "زانایە" بە هەموو شتێك.. هەر وەك لە هەموو شتێکدا "دانایە" و ناگونجێ هیچیان لە یەکتر جیا ببنەوە.

خوای گەورە لە هەموو شتێکدا حیکمەتێکی هەیە، چونکە خوای گەورە کاری نابەجێ ناکات.

کەواتە هەمیشە "دانست" گوێڕایەڵی "زانست"ەکەیەتی و، لە هەر شوێنێکدا "زانست" دەربکەوێت و "توانست" و "ویست" ببووژێنەوە، دەبینیت "دانست"یش لەوێ تابلێی درەخشانە و دەبریسکێتەوە. بەڵام زۆربەی جار تەکلیف و داواکاریی خواوەند بە لای دەروونەکانمانەوە ناخۆشە، چونکە هیچ زانیارییەکمان لە بارەی ئەم سوود و بەرژەوەندییانەوە نییە و لە ڕووی ئەنجام و ئاکامەکانیشەوە جوانیی ئەم تەکلیفانە نازانین، واتە نازانین ئەمانە لە جۆری "حَسَنٌ لغيرها"ن، وەك لە زاراوە فیقهییەکاندا باس کراوە. چونکە مرۆڤ گەر لەم گۆشەیەوە، واتە لە ڕووی ئەنجامەکانەوە بۆ ئەو شتانە بڕوانێت، ئەوا گەلێ حیکمەت و بەرژەوەندییان تێدا دەبینێت. بەڵام خراپکاری و گوناهەکان پەیوەندییان بە دەستکەوت(کسب)ی تایبەتی خۆمانەوە هەیە.

ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە بە تەواوی ئەم مەسەلەیە ڕوون دەکاتەوە:

﴿كُتبَ عَلَيكُمُ القِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَكُم وعَسى أن تَكرهُوا شَيئاً وَهوَ خَيرٌ لكُم وَعَسى أن تحُبُّوا شيئاً وَهُوَ شرٌ لكم واللهُ يَعْلَمُ وأنتم لا تعلمون﴾(البقرة:٢١٦).

واتە زۆر شت هەن کە هەرچەندە بە ڕواڵەت ناشیرین و بێزراون، کەچی گەلێ بەرژەوەندی و سوودیان تێدایە. بۆ نموونە: دەستنوێژگرتن لە کاتی سەرمادا و بڕینی ڕێی دوور بۆ گەیشتن بە جەماعەت لە مزگەوتدا و چاوەڕوانکردنی نوێژ لە دوای نوێژ و شتانی تری وەك ئەمانە، بە لای نەفسەوە، قورس و ناخۆش و بێزراون. کەچی لە

ژێر ئەم قورسی و ناڕەحەتی‌یەدا چەندین هەنگاوی یەك لە دوای یەك هەن بۆ نزیكبوونەوەی مرۆڤ لە بەهەشت و بەهرەوەربوونی - قۆناغ لە دوای قۆناغ - لە میهرەبانیی خوای گەورە. هەروەها هەندێ شتی تریش هەن کە دەروونی مرۆڤ حەزیان لێ دەکات و مرۆڤ دەورووژێنن و بەرەو جیهانی ئارەزووبازی دەیدەنە بەر، کەچی ئەنجامەکەیان بریتی دەبێت لەوەی کە مرۆڤ دەخەنە شیوەکانی دۆزەخ و هەنگاو لە دوای هەنگاو لە میهرەبانیی خوای گەورە دووری دەخەنەوە.

حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب - خوای لێ ڕازی بێت - تێگەیشتنی ئەم مەسەلەیەی پێکاوە کاتێ کە بەم واتا و ناوەرۆکەی خوارەوە فەرموویەتی:

"نازانم ئایا بە خێر ڕۆژم لێ بووەتەوە یان بە شەڕ، خۆ هەر کامیشیان بێت هەر گوێی پێ نادەم، چونکە لەوانەیە ئەو شتەی کە دەروونم پێی باشە لە ڕاستی‌دا خراپ بێت و، ئەوەش کە بە خراپی دادەنێت لە ڕاستی‌دا خێری تێدا بێت"!

بناغەی ئەم کارە بریتی‌یە لە: ملکەچبوون بۆ هەر شتێك کە خوای گەورە بڕیاری لەسەر داوە و نەگەڕان بە دوای حیکمەتی شتێکی نەزانراودا. ڕاستە، دەبێ ئێمە هەوڵ بۆ کردەوەی چاك بدەین و نیازی باش لە دڵماندا هەڵبگرین و، نابێ بە ڕواڵەتی ئەمر و نەهی‌یەوە خۆمان بخەڵەتێنین، بەڵکو پێویستە گوێڕایەڵیی تەواوەتیی فەرمانەکانی خوای گەورە بکەین.

باشترین نموونەی ئەم بوارە ڕێکەوتنەکەی حودەیبییەیە؛ چونکە چەند هەڵوێست و تابلۆیەکی ئەوتۆی تێدایە گەر بێت و لە ڕووی مولکەوە، واتە لە ڕووی ڕواڵەتەوە، سەیر بکرێن هەرگیز دەروونی مرۆڤ حەزیان پێ ناکات، بەڵام گەر لە ڕووی مەلەکووت و لایەنە "لەدونی"یەکانەوە بۆیان بڕوانین، تێ‌دەگەین کە ئەوانە، وەك قورئان ناوی لێ ناون: "فتح قريب"ن.

بەڵێ، لەوانەیە دەروونی مرۆڤ ڕووی ڕواڵەتی حودەیبییەی پێ قبووڵ نەکرێت؛ دەڵێیت هەر شتێك کە دژایەتیی ئیسلامی تێدا بێت لەو ڕێکەوتنەدا کۆبووەتەوە، لە کاتێكدا کە بچووکترین مافی هاوەڵە بەڕێزەکانی تێدا ڕەچاو نەکراوە کە ئامادەن هەموو شتێکی بەنرخی خۆیان لە پێناوی ئایینەکەیاندا بەخت بکەن! خۆ ئەوان لەو کاتەدا هەموو هەست و نەستێکیان ئامادە و تاسەمەندی تەوافی کەعبەی پیرۆز بوو..

بەڵێ، ئەو هاوەڵە بەڕێزانە چەندەها ساڵە بە تاسووقی ئەم دەرفەتەوە چاوەڕوانی دەکەن، کەچی وا دوژمنان ڕێ لە هێنانەدیی ئەم خواستەیان دەگرن. بۆیە لە دەروونەوە هەستیان بە سەختی و قورسیی گەڕانەوە دەکرد لەو شوێنە نزیکەی کەعبەوە بەرە و "مەدینە"! خۆ ئەو دەروونانەی کە خۆیان بۆ تەوافی کەعبە ئامادە کردبوو هەروا ئاسان نەبوو مل بۆ

بەندەکانی ئەم ڕێکەوتننامەیە بدەن. بە تایبەت دوای ئەوەی کە بە چاوی خۆیان بینی یان "ئەبوو جەندەل" هات و پەنای بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا، کەچی بە کۆت و زنجیرەکەیەوە درایەوە بە کافران! بێ گومان ئەم دیمەنە گەلێ ئازاری دەروونی هاوەڵە بەڕێزەکان دەدات.. بەو واتایەی کە هەرچی لە ڕواڵەتی حودەیبییەدا ڕووی دا بە پێچەوانەی حەز و ئارەزووی ئیماندارانەوە بوو.

بەڵام سەرەڕای ئەو تووڕەیی‌یەی کە لە دەروونی ئیمانداراندا گەیشتبووە چڵەپۆپە، پێغەمبەری ئازیز ﷺ هێمنی و ئارامیی خۆی پاراستبوو، چونکە دڵنیابوو لەوەی کە ئەنجامی ئەم ڕێکەوتننامەیە بە خێری موسڵمانان تەواو دەبێت، کە ئەمەش ناوەرۆکی ئەو زەردەخەنە شیرینەی سەر لێوی بوو کە لە ژێر ڕوانینە ئازار بەخشەکانیەوە دەری‌خست! لە ڕاستیش‌دا تێگەیشتن لە هەموو لایەنەکانی ئەم مەسەلەیە کارێکی گەلێ دژوارە، تەنانەت حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب - خوای لێ ڕازی بێت - کە لەو دەمەدا لە نهێنیی ئەم مەسەلەیە تێ نەگەیشتبوو، لە دوایی‌دا کە لێی تێ گەیشت تا کۆتایی ژیانی بۆ پەشیمان‌بوونەوەی لەو هەڵوێستەی کە لە حودەیبییەدا لێی دەرکەوت تۆبە و ئیستیغفاری دەکرد و خێر و صەدەقەی دەبەخشی‌یەوە!

جا دوای نازڵ‌بوونی ئایەتە پیرۆزەکان، یەك لە دوای یەکی گرێ کوێرەکان کرانەوە و کێشە تەماوی‌یەکانیش بە هەموو لایەنە دیار و نادیارەکانی مەسەلەکەوە لای هاوەڵە بەڕێزەکان ڕوون بوونەوە..

بەڵێ، "حودەیبییە" خۆی لە خۆی‌دا "فەتح"ە، چونکە قورەیش وای لێ هات پەیمان لەگەڵ موسڵماناندا ببەستێت، خۆ ئەمەش لە خۆی‌دا دانانێکی ڕەسمی‌یە بە بوونی موسڵماناندا، هەروەك موسڵمانانیش عومرەی ساڵی داهاتوویان دەستەبەر کرد، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە کەعبە تەنها هی خەڵکی مەککە نی‌یە. هەر ئەمەش بوو کە گیانی ئازایەتیی بە بەری تیرە و هۆزەکانی تردا کرد. ئنجا ڕێکەوتنی حودەیبییە دەرفەتێکی گەلێ مەزن بوو بۆ موسڵمانان تاکو بانگەوازەکەیان بە هەموو لایەك‌دا بڵاو بکەنەوە، چونکە لەو ڕێکەوتننامەیەدا بڕیار درا ئەم دوو لایەنە تا دە ساڵی ڕەبەق شەڕ لەگەڵ یەکتری‌دا نەکەن. هەر بەو جۆرەش بوو، چونکە دوای ئەوە و لەم ماوە درێژخایەنەدا ئایینی ئیسلام بە تیرە و هۆزەکان ڕاگەیەنرا و، ئەو تیرە و هۆزانەش یەك لە دوای یەك هاتنە ناو ئایینی ئیسلامەوە. کەواتە حودەیبییە لە ڕاستی‌دا فەتحێکی بەرجەستە و ئاشکرایە[1].

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير ١٨٨/٤-٢٠٢.

نموونەیەکی تر لە بەسەرهاتی حەزرەتی یووسفەوە - دروودی لەسەر بێت - دەهێنین، تاکو لایەنی "مەلەکووتی"ی ڕووداوەکان ببینین و ڕووە جوانەکانیان بخەینە پێش چاو:

ئەوەبوو بۆ ئەوەی حەزرەتی یووسف - دروودی لەسەر بێت - ببێت بە عەزیزی میسر، دەبوو یەکەم جار بخرێتە ناو بیرەکەوە و، پاشان بە وێنەی کۆیلە بفرۆشرێت و، ئنجا بخرێتە بەندیخانەوە.. حەزرەتی یووسف - دروودی لەسەر بێت - ئازاری هەموو ئەمانەی چەشت و بە سەرکەوتنێکی ڕوونی ئەوتۆ کە شایانی پێغەمبەرێکی بەڕێز بێت، هەموو تاقیکردنەوەکانی بڕی. کەواتە لە پشتی هەموو ئەو ڕووداوانەی کە بە ڕواڵەت قورس و سەخت و نەفرەت لێ کراون، پلەیەك هەیە بۆی دەڕوات و سەردەکەوێت تاکو فەرمانڕەوایەتی بگرێتە دەست و ڕۆڵی خۆی لە چارەنووسی نەتەوەدا ببینێت، هەروەك لە ڕاستیشدا حەزرەتی یووسف - دروودی لەسەر بێت - گەیشتە ئەم پلەیە.

پێغەمبەری سەروەریشمان ﷺ لە بارودۆخێکی ئاوا سەختدا کە ئازار و تەنگانە دەورەیان دابوو، تەنانەت گشت ڕووداوەکانیش لە دژی ئەو بوون، سەرکەوت بۆ میعراج.. کاتێك بوو کە موسڵمانان ئابڵۆقەی کافرانیان لەسەر دانرابوو، لە هەمان کاتیشدا دوو کەس لەوانەی کە پشتگیری پێغەمبەر بوون ﷺ کۆچی دواییان کرد و، نە حەزرەتی "خديجة الكبرى" و نە "أبو طالب"ی مامی لە ژیاندا نەمان.. ئەمە سەرەڕای ئەو دڵشکاوییەش کە لە گەشتەکەی طائیفدا تووشی بوو[1].

ئا لەم کاتەدا بوو کە بانگێشتنی ڕێزلێنان و شەرەفمەندانەی لە لایەن خوای گەورەوە بۆ هات تاکو بەرزی بکاتەوە بۆ ئاسمان. ئەوەبوو بەم میعراجە تا پلەی "قاب قوسين أو أدنى" (کە پلەیەکە لە نێوان ئیمکان و وجووبدا) بەرز بووەوە. بەڵێ، گەیشتە جێیەکی ئەوتۆ کە تەنانەت حەزرەتی جوبرەیلیش - دروودی لەسەر بێت - نەیدەتوانی بە ئەندازەی پەنجەیەکیش بەرەو پێش بڕوات و تەنها بە بینین چاوی لە پێغەمبەرەوە بوو ﷺ[2]!

سەبارەت بە حەزرەتی مووسایش - دروودی لەسەر بێت - ئەوا هەر لە دەمی لەدایكبوونیەوە گیرۆدەی بارودۆخە سەختەکان بوو، چونکە خرایە ناو زەمبیلەیەك و ئنجا خرایە ناو ڕووبار و پاشان خوای گەورە لە کۆشکی فیرعەونی دوژمنی مووسا و

(١) البداية والنهاية لابن كثير ٣/١٥١-١٦٦.

(٢) البداية والنهاية لابن كثير ٣/١٣٥-١٤٥.

دوژمنی هەرە گەورەی خوای گەورەدا جێگای کردەوە.. پاشان دوای ئەوەی کە زللەی لە مرۆڤێکی قیبطی وەشاند و کوشتی[١]، کەوتە ژیانی نامۆیی دوور لە کەس و کارەوە. بەڵێ، گۆڕینی نەوەی ئیسرائیل - کە وەك شەیتان وابوون - بە کەسانێکی مەلائیکەتئاسا، پێویستی بە برین و هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی ژیانێکی ئاوا سەخت بوو، تاکو حەزرەتی مووسای پێ ئامادە بکرێت بۆ ئەو ئەرکە دژوارە. جا هەرچەندە زنجیرەی ئەم ڕووداوانەی کە بە ڕێکی و یەك لە دوای یەك هاتنە ڕێی حەزرەتی مووسا - دروودی خوای لەسەر بێت - بە ڕواڵەت ناخۆشن و لەسەر دڵی مرۆڤ قورس و نەفرەت لێ کراون، کەچی خوای گەورە، چاکە و خێری ڕەها لەم سەرەتا پڕ لە ڕووداوە سەخت و بێزراوانە بەدیدەهێنێت.

ئەی حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - چۆن بەرز کرایەوە بۆ ئاسمان؟ ئەوەبوو دوای چەندەها گیروگرفت و تەنگ پێهەڵچنین و چاودێری لەسەردانانی سامناك و یەك لە دوای یەك، خاچی بۆ ئامادە کرا تاکو پیایدا هەڵبواسرێت..

بەڵام خوای گەورە لەو کاتەدا، بە دەستی سۆز و میهرەبانیی خۆی، بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان[٢]. جا هەر وەك لەدایكبوونی حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - موعجیزەیەك بوو بۆ خۆی، ڕۆشتنیشی بۆ ئاسمان موعجیزەیەکی تری حەزرەتی عیسا بوو، دروودی لەسەر بێت.

هەمان شت لە نەتەوەی حەزرەتی محمدیشدا ﷺ ڕوودەدات و، پشت بەخوا، بە وێنەی نەتەوەکانی پێشوو، خوای گەورە چەندین خێر و بێریان لەم گیروگرفتانە بۆ بەدیدەهێنێت کە ئێستا پێوەی دەناڵێنن و، دوای برینی ئەم ڕووداوە گەورە و سەختانەی کە بە ڕواڵەت ئازاربەخش و نەفرەت لێ کراون، خوای گەورە دەروویان لێ دەکاتەوە و نیعمەتی سەرکەوتنیان پێ دەبەخشێت.

جا هەموو ڕووداوێك، هەر لە سەرەتاوە هەتا کۆتاییەکەی، لە زانستی خوای گەورەدا گەلێ نهێنیی زۆری وەك ئەمانەیان تێدایە. چونکە خوای گەورە کە هەرخۆی "ئەووەل و ئاخیر و ظاهیر و باطین"ە ڕووی مولك و مەلەکووتی هەموو شتێك دەزانێت و ئاگای لێیەتی. جا "قەدەر" ناونیشانێکی پڕ لە نهێنیی ئەم زانینەی خواوەندە بەم چۆنێتییە. کەواتە "قەدەر" ناوێکی ترە بۆ حەقیقەتی "لەوحی مەحفووظ".

---

(١) بڕوانە سوورەتی (القصص: ١-٣٥).

(٢) بڕوانە سوورەتی (النساء: ١٥٨).

**٢ - قەزا و قەدەر لەو ڕووەوە کە خوای گەورە هەموو شتێك دەنووسێت.**

تەقدیر و دەستنیشانکاریی پێشوەختی خوای گەورە بۆ شتانی ئایندە و، ئنجا هاتنەدیی ئەو ڕووداوانە لەو کاتە دیاری کراوانەدا.. ئەم کارە - لە ڕاستیدا - نووسینێکە، لە ڕووی زانستی خواوەندەوە، تایبەتە بە قەزا و قەدەرەوە.. هەروەها نووسینی هەموو شتێکیش لە کاتی ڕوودانیدا، نووسینێکی ترە و پەیوەندیی بە لێپرسینەوەی مرۆڤەوە هەیە لەسەر کردەوەکانی.

بەڵێ، هەرچی ڕوو دەدات و هەر ڕووداوێکیش بەسەر ژیانماندا تێدەپەڕێت، هەر هەموویان، چرکە بە چرکە و یەك لە دوای یەك تۆمار دەکرێن و دەنووسرێن، دەڵێی تۆمارێکی هەڵواسراون بەسەر تەنافی شەو و ڕۆژی زەماندا. ئێمە ئەم نووسینە ناو دەنێین: "تەقدیری ڕۆژانە".

بەڵێ، هاوکات لەگەڵ نووسینی ئەو مەلائیکەتانەی کە قورئانی پیرۆز لە بارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿كِرَاماً كَاتِبِينَ ۞ يعلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ﴾(الانفطار:١١-١٢) نووسینێکی تر هەیە کە بریتییە لە نووسینەوە و لەبەرگرتنەوەی چەند لەوحێکی قەدەری لەبەر نووسینەکەی "ئیمامی موبین" لە "کیتابی موبین"دا[1].

نووسینی یەکەم ئەم ئایەتە مەزنە پیرۆزە ڕوونی دەکاتەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَكُلَّ إِنْسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَومَ الْقِيَامَةِ كِتَاباً يَلْقَاهُ مَنْشُوراً﴾(الإسراء:١٣). بەو واتایەی کە "نووسینێکی عیلمی" هەیە و خاوەنی وجوودی خاریجی نییە و بریتییە لەوەی کە پێی دەڵێن: "لەوحی مەحفووظ". نووسینێکی تریش هەیە کە مەلائیکەتە بەڕێزەکان دەینووسن و خاوەنی وجوودی خاریجییە و هەموو ئەو کردارانەی تێدا تۆمار دەکرێت کە مرۆڤ دەیانکات.

لە ڕاستیدا هەردوو نووسینەکە بە تەواوەتی وەکو یەك وان و تەنانەت جیاوازیی یەك دانە پیتیش لە نێوانیاندا نییە. واتە ئەو کردارانەی کە مرۆڤ دەیانکات هەر ئەوانەن کە پێشتر لە زانستی خوای گەورەدا تەقدیر کرابوون، ئەوەندە هەیە کە ویستی خۆمان دەبێتە هۆی ئەوەی وجوودی خاریجی بکات بە بەر ئەو نووسینەی کە تەنها وجوودی عیلمیی هەیە، چونکە ئەم نووسینەی دووهەم ویستی ئێمەی تێدا ڕەچاو کراوە.

لە ڕۆژی دادگای هەرە گەورەی حەشردا بەپێی بەراورد کردنی هەردوو نووسینەکە بڕیار لەسەر مرۆڤ دەردەکرێت و، ڕوون دەبێتەوە کە هەریەك لەو دوانە هەمان

---

(١) لە پەیامی (من) ل (٤١ - ٤٣)دا مەبەست بەم دوانە ڕوون کراوەتەوە، هەروەها بڕوانە: (وتەکان) ل ٧٨٣-٧٨٤. (وەرگێڕ)

نووسینی ترە و جیاوازی‌یان لە نێوان‌دا نی‌یە. چونکە مەلائیکەتە بەرێزەکە دەفەرموێت: ئەی پەروەردگارم! من ئاوا و ئاوام نووسی. پەروەردگاری مەزنیش نووسینێك دەخاتە پێش چاو، ئنجا دەفەرموێت: منیش ئاوام نووسی، چونکە پێشتر دەمزانی کە ئەو کردارانە دەکات. واتە یەکێك لەو دوو نووسینە بە دەستی مەلائیکەتەوەیە و ئەوی تریشیان بە دەستی خواوەندی گەورە و پەروەردگارەوەیە.

جا ئەو نووسینەی کە لە لایەن ئەو مەلائیکەتە نووسەر و بەرێزانەوە تۆمار دەکرێت کە شان و شکۆیەکی بەرزیان هەیە و دانابەزنە ئاستی کاری نزم و بێ‌نرخ و هەرگیز گومان توخنی نووسینەکەیان ناکەوێت، ئەم نووسینە، ڕوویەکی تری قەزا و قەدەرە.

بەڵێ، خوای گەورە پلان و پرۆگرامی هەموو شتێك دادەنێت و "وجوودی عیلمی"ی دەداتێ، پاشان لە ڕێی پەیوەندی‌کردنی "توانست" و "ویست"ی خۆیەوە بەم وجوودە عیلمی‌یە "بوونی دەرەکی"شی پێ دەبەخشێت. لەبەر ئەوە، هەموو شتێك یەکەم جار بەپێی ئەو وجوودە عیلمی‌یە دەنووسرێت، ئنجا ئەو کردارانەی کە مرۆڤ دەیانکات بە تەواوی یەکاویەك دەردەچن لەگەڵ ئەو نووسینەدا و هەر ئەم کردارانەشن کە مەلائیکەتە بەرێزەکان دەیان‌نووسن. با هەوڵ بدەین ئەم مەسەلەیە لە ڕووناکیی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا ڕوون بکەینەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَلَقد كَتَبْنا فِي الزَّبُورِ مِن بَعدِ الذِّكر أنَّ الأرضَ يَرِثُها عِبَـادِيَ الصَّـالِحُونَ﴾(الانبياء:١٠٥). "ذیکر" خۆی لە خۆی‌دا بە واتای ئامۆژگاری دێت، بەڵام لێرەدا بە واتای "تەورات" یان "لەوحی مەحفووظ" - کە واتایەکی گشتی ترە - بەکار هاتووە. جا بەپێی ئەم واتایە دەتوانرێت ئایەتەکە بەم شێوەیەی خوارەوە لێك‌بدرێتەوە:

دوای ئەوەی خوای گەورە شتانی ناو "لەوحی مەحفووظ"ی نووسی، ئنجا لەو کتێبانەدا کە بۆ پێغەمبەرانی - علیهم السلام - نارد چەند شتێکی لە بەر نووسینەکانی "لەوحی مەحفووظ" گرتەوە و بۆی نووسین کە ئەویش بریتی‌یە لەوەی: "بەندە چاکەکانم میراتگری زەوی دەبن". واتە میراتگری ڕاستەقینە و هەمیشەیی زەوی، بەندە چاکەکانی خواوەندن، بەڵام فەرمانڕەوایەتی کەسانی تر بۆ زەوی شتێکی کاتی‌یە، چونکە فەرمانڕەوایەتیی هەمیشەیی، کە بە بەردەوامی نوێ ببێتەوە، هی بەندە چاکەکان و ئەو نەتەوە و کۆمەڵگا باشانەن کە لەوانە پێك‌دێن. ئەمەش وەك یاسایەك لە "لەوحی مەحفووظ" دا بڕیاری لەسەر دراوە و لە "زەبوور"یش‌دا ئەم یاسایە تۆمار کراوە و لە لەوحی مەحفووظەوە بۆی هێنراوە.

بەڵێ، ئەو زەبوورەی کە دەستکاری نەکراوە و بۆ حەزرەتی داوود - دروودی لەسەر بێت - ڕەوانە کراوە، ئەم یاسایەی تێدا بووە.

ڕاستە، لەوانەیە چەند ڕژێمێك لەوانەی کە خوای گەورە پێیان ڕازی نی‌یە، لە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا، سەر هەڵ بدەن.. لەوانەیە لە هەموو شوێنێكدا چەندین فیرعەون و کەسانی سەرسەخت و ملنەدەر پەیدا ببن.. بەڵام بۆ ماوەیەکی کاتی و دیاری کراو. ئەمەش ئەو یاسایە هەڵناوەشێنێتەوە کە لە لەوحی مەحفووظ و زەبووردا نووسراوە و قورئانی پیرۆزیش هەواڵەکەی ڕاگەیاندووە، چونکە مەبەست لەو میراتگری‌یە ناوبراوە: میراتی بەردەوام و فەرمانڕەوایەتیی درێژخایەنە. خۆ سەرهەڵدانی کاتیی فەرمانڕەوایەتی‌یە خراپەکان، لەسەر بناغەی حیکمەتێکی خوایی‌یە کە بریتی‌یە لە: بێدارکردنەوە و یادخستنەوەی موسڵمانان تاکو بە پەلە و خێرا لەناو خۆیاندا یەكبگرن. ئەمەش یاسایەکی خوایی‌یە هەرگیز هیچ کەسێك ناتوانێت ئاڵوگۆڕی تێدا بکات.

کەواتە خاوەن ڕەوشتە بەرزەکان یان ئەوانەی بەشێکی زۆریان لەو ڕەوشتە بەرزانە هەیە، لە سەردەمی خۆیاندا دەبن بە فەرمانڕەوای زەوی. شایانی سەرنجە کە مەبەست لە "ڕەوشتە بەرزەکان" تەنها سەردانی مزگەوت و ڕەفتارەکانی وەك ئەوە نی‌یە، بەڵکو مەبەست ڕەفتارکردنە بە سەرجەم ڕەوشتە جوانەکانی پێغەمبەر ﷺ لە هەموو گۆشە و لایەکی ژیاندا. هەر تەنها بەم ڕەوشتە بەرزانەیە کە مرۆڤ پەی بە واتای شتان و ڕووداوەکان و پەیوەندیی مرۆڤ بە بوونەوەرانەوە دەبات، هەروەك لەم ڕێ‌یەوە دەتوانێت هاوسەنگیی تەواوەتی ڕاگیر بکات لە نێوان ڕۆچوونی‌دا لە قوڵایی "دەروون" و بیرکردنەوەی‌دا لە فراوانیی "ئاسۆکان"ی دەرەوە. بە واتایەکی تر ئەو کەسەی توانیبێتی پەی بە "خلوود" ببات هەر ئەوە دەتوانێت چاکی و صەلاحەت، بە واتا ڕاستەقینەکەی، لەسەر زەوی‌دا بهێنێتەدی.

ئەوانەی کە تیرۆر و تۆقاندن و فەوزا و ئاژاوە لە شوێنە جیاجیاکانی جیهاندا دەنێنەوە و.. لە بەرامبەر تاوانەکانەوە تاوان ئەنجام دەدەن و.. بۆ مەبەستی ڕاکێشانی سەرنجی ڕای گشتی، چەندین درووشمی سیاسی هەڵدەواسن و.. بە "ژیری"ی خۆیان دەنازن و واز لە "شوورای" نێوانیان دەهێنن.. هەرگیز ئەوانە ناتوانن "فەرمانڕەوایەتی" بە واتا ڕاستەقینەکەی، دابمەزرێنن. پشت بەخوا ڕۆژێك لە ڕۆژان و لە دەمی هەڵهاتنی خۆری ئیسلامدا لەو بێ‌ئاگایی‌یەی خۆیان بە خەبەر دێن و، لەو کارانەیان پەشیمان دەبنەوە و دەزانن لە چ تاریکستانێكدا سەرگەردان بوون و، دان بە هەڵەی خۆیاندا دەنێن!

بەڵێ، ئەو مرۆڤەی کە بە "رێز لێگیراوی" بەدیهێنراوە، رۆژێك دێت کە رێگەی راست بدۆزێتەوە. چونکە گەر وا نەبێت ئەوا ئەم یاسایە - پەنا بەخوا - هەڵە دەردەچێت. خۆ ئاشکرایشە کە یاسایەك خوای گەورە دایبنێت هەرگیز ئاڵوگۆڕی بەسەردا نایەت، چونکە: ﴿لا تَبديلَ لِخَلقِ اللهِ﴾(الروم:٣٠)[1].

بەڵام خوای گەورە یاسایەکی تری هەیە کە بریتییە لە یاسای:

﴿إنَّ اللهَ لا يُغَيِّر مَا بِقَومٍ حتى يُغَيِّرُوا مَا بأنفُسِهِم﴾(الرعد:١١).

کەواتە خوای گەورە زەلیلی بەسەر نەتەوەیەکدا ناهێنێت کە خاوەنی عیززەت و تاجی سەر بوو بێت، مەگەر ئەو نەتەوەیە ناوەوەی خۆی بگۆڕێت. ئەم یاسایە هەردوو واتا ئیجابی و سەلبییەکە وەکو یەك دەگرێتەوە. کەواتە ئەو کەسەی دەیەوێت نازناوی "فاتح" بەدەست بهێنێت دەبا لە پێش‌دا قەڵای نەفسی خۆی فەتح بکات. خۆ ئەگەر نەیتوانی ناوەوەی خۆی فەتح بکات، ئەوا هیچ شتێکی لە دەرەوەی نەفسی خۆیدا پێ فەتح ناکرێت!

ئەو کەسانەی کە لە ناوەرۆکی ئەو "تەقوا" و "ئیحسان"ە تێ گەیشتوون کە لەم ئایەتە پیرۆزەدایە: ﴿إنَّ اللهَ مع الذينَ اتَّقَوا والَّذِينَ هُم مُحسِنُونَ﴾(النحل:١٢٨) هەر ئەوانەن کە شەرەفمەندی لەگەڵدابوونی خواوەندن.

ئایا "ئیحسان" چییە؟

"ئیحسان" ئەوەیە کە کاتێ خوای گەورە دەپەرستیت وەکو ئەوەی بە چاو بیبینیت ئاوا بیپەرستیت.. ئیحسان بریتییە لە نووری دیوی ناوەوەی مرۆڤ.. بریتییە لە فراوانی و قووڵیی هەست و نەستەکان.. بریتییە لەوەی مرۆڤ ئەو توانا و مەلەکەیە بەدەست بهێنێت کە بتوانێت راستەوخۆ بڕواتە ناو دیوی ناوەوە، بێ ئەوەی بکەوێتە داوی دیلیی خۆپەرستیی نەفسەوە.. بریتییە لە دەستکردن بە فەتحی دەرەوە لە ناوەوە.. پارێزگاری کردنی ئەم فەتحەیە لە هەموو قۆناغەکانی‌دا.. بە واتایەکی تر بریتییە لە بەدەستهێنانی "صەلاحەت"ی تەواوەتی.

ئێمە لە مەسەلەی "نووسین"ی کردەوەکانەوە سەرمان کێشا بۆ ئەم باسە. بابەتە سەرەکییەکەمان بریتییە لەوەی کە ئەم یاسایە و یاساکانی تری هاوچەشنی، بە جۆرێکی هەرگیز نەگۆڕ، لە "لەوحی مەحفووظ"دا نووسراون.

---

(١) هەروەها: ﴿وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللهِ تَبديلاً﴾.

جا لەبەر گرنگیی ئەم مەسەلەیە - بێ ئەوەی سنووری پەیوەندیی ئەم باسە بە قەدەرەوە بشکێنین - ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە دەهێنین:

﴿وَعَدَ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُم وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرضِ كَمَا استَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُم دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُم وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِم أمْناً يَعْبُدُونَنِي لا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئاً وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذلكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الفَاسِقُونَ﴾(النور:٥٥).

خوای گەورە لەم ئایەتەدا بەڵێن بەوانە دەدات کە باوەڕیان هێناوە و کردەوەی چاکیان کردووە. ئەمە بەڵێنێکی خوای گەورەیە. خۆ بەڵێنی خوای گەورەش - بێ هیچ گومانێك - ڕاستە و دەبیاتە سەر. چونکە بەڵێن‌شکێنی سەبارەت بە خواوەندەوە مەحاڵە و خوای گەورە دەتوانێت بەڵێنەکەی بباتە سەر و فەرمانڕەوایە بەسەر هەموو شتێك‌دا.

کەواتە بێ گومان بەڵێنی جێ‌نشین‌کردنی زەوی بۆ ئەوانە دەباتە سەر کە باوەڕیان هێناوە و کردەوەی چاکیان ئەنجامداوە. ئەو کاتەش جڵەوی ژیانی کۆمەڵایەتی دەکەوێتە دەستتان و، ژیانی ئابووریش ئێوە ڕێکی دەخەن و، پەروەردەی تاك و خێزانیش سیستەمێکی نوێ بە خۆیەوە دەبینێت. ئەو کاتە ئێوە هەموو جیهان بەڕێوە دەبەن. چونکە هەموو شتێکی ئەم جیهانە لە ئەنجامدا بە دەستی ئێوە دەبێت. خۆ ئەوانەی کە لە دەوری مێزە بازنەیی‌یەکان(مێز گردەکان)دا دادەنیشن و جیهان لە نێوان خۆیاندا دابەش دەکەن، لەو ڕۆژەدا هەر بڕیارێك دەربکەن لە پێش‌دا دەم‌وچاوی ئێوە دەخوێننەوە و سەیری سەروسیمای ئێوە دەکەن و، جوگرافیای کۆمەڵیش بەپێی فەرمانەکانی ئێوە شکڵ و شێوەکانیان دەگرنەخۆ، تەنانەت هەوڵ دەدەن لە ڕێی ڕوانین و ئاماژەکانی ئێوەوە لە واتا و ناوەڕۆکەکان بگەن و، هەر ئێوە - بە وێنەی مێژووی پێشینتان - خاوەن بڕیار دەبن لە دانان یان لابردنی هەر کەسێك‌دا و، پادشایانیش لە بەردەرگاکانی ئێوەدا بە ئاواتەکانیان دەگەن و، گوفتارەکانتان لەگەڵیاندا بە "فەرمان" دادەنێن لە ئێوەوە بۆ خۆیان و، هەر شتێك ئێوە بیڵێن یەکسەری جێ‌بەجێ دەکرێت و دێتەدی، هەر شتێکیش ئێوە نەتانەوێت یەکسەری و خێرایی لادەبرێت! کەواتە ئێوە ئەوانەن کە خوای گەورە لەو ڕۆژەدا توانا و دەسەڵاتی جێ‌نشینیتان پێ دەبەخشێت!

ئەم گوفتارە ئەندێشە و ئاوات و گوفتارێکی دوور لە واقیع نی‌یە.. چونکە ئەوانەی کە لە ڕابوردوودا "صەلاحەت"یان بەدەست هێنا، گەیشتنە ئەم چڵەپۆپەیە. خۆ ئەمەش

یاسایەکی خواییە و لە هەموو کات و شوێنێکدا دەستبەکارە. جا ئەگەر ئێوە هەرکات لە دەروونی خۆتاندا صەلاحەتتان بەدەست هێنا، ئەوا ئەنجامەکانیشی دێنەدی و بە بێ گومانی بەرجەستە دەبن.

بەو واتایەی کە دوو نووسین هەیە، نووسینی یەکەمیان: ئەوەیە کە لە "لەوحی مەحفووظ"دا نووسراوە؛ هەموو شتێك بە "وجوودی عیلمی" لە لەوحی مەحفووظدا وجوودی هەیە.. نووسینی دووهەمیش: نووسینی ئەو ڕووداوانەیە کە یەك لە دوای یەك دێنە وجوودی دەرەکی. هەر تەنها ئەو کردەوانەش لەم نووسینەدا لێپرسینەوەیان لەسەر هەیە کە لەسەر بناغەی "ویستی مرۆڤ" ئەنجام دراون.

ئەم ئایەتە پیرۆزە هەردوو نووسینەکە پێکەوە باس دەکات:

﴿إِنَّا نَحنُ نُحيِي الموتَى ونَكْتُبُ مَاقَدَّمُوا وآثَارَهُم وَكُلُّ شَيءٍ أحصَينَاه فِي إمَامٍ مُبِين﴾(يس: ١٢).

کەواتە هەموو ئەو کردارانەی کە مرۆڤ دەیانکات و ئەو صەدەقە بەردەوام و جارییانەش کە دوای خۆیان بەجێیان دەهێڵێت، هەر هەموویان - بە بێ جیاوازی - دەنووسرێن. کە ئەمەش بریتییە لە نووسینی دووهەم. جگە لەوەی کە هەموو شتێك پێشتر بە "وجوودە عیلمی"یەکەی نووسراوە، وەك لە خودی ئایەتەکەدا بە ڕوونی دیارە کە دەفەرموێ: ﴿وَكُل شَيءٍ أحصَينَاهُ فِي إمَامٍ مُبِين﴾. کەواتە هەموو شتێك، بە بێ پشت گوێخستنی هیچ کامیان، لە لەوحی مەحفووظدا نووسراوە، هەروەك ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە ڕوونی دەکاتەوە:

﴿وَمَا مِن دَابَّةٍ فِي الأَرضِ وَلا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيهِ إلاَّ أُمَمٌ أمثَالُكُم مَا فَرَّطْنَا فِي الكِتَاب مِن شَيءٍ ثُمَّ إلَى رَبِّهِم يُحْشَرُونَ﴾(الانعام:٣٨).

زۆربەی تەفسیرنووسان وشەی "الكتاب"ی ئەم ئایەتە پیرۆزەیان بە: "لەوحی مەحفووظ" لێکداوەتەوە، هەروەك هەندێکیشیان بە: "قورئان" ڕاڤەیان کردووە.

فەرموودەیەکی پیرۆز هەیە لە بارەی نووسینی دووهەمی لەمەڕ ئەو کردارانەی کە مرۆڤ بە "ویست"ی خۆی دەیانکات و، دەریدەخات کە دوای نووسینی یەکەم دێت.

ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە:

"كانَ اللهُ و لم يكنْ شيءٌ غيرَه، وكان عرشُه على الماءِ، وكتبَ في الذكرِ كُلَّ شيءٍ، وخَلَقَ السَّموات والأرضَ"[1].

(١) رواه البخاري: بدء الخلق ١، والترمذي: تفسير سورة المائدة ٥/٣.

کەواتە هەموو شتێك بەپێی دروستبوونی یەك لە دوای یەکیان دەنووسرێن. جا ئەم نووسینە ڕووی دووهەمی "قەدەر" پێكدەهێنێت.

**٣ - قەزا و قەدەر لە ڕووی "ویست"ی خواوەندەوە.**

**یەکەم:** ویستی خوای گەورە لە ئایەتە پیرۆزەکاندا:

وشەکانی: (شاءَ، یشاءُ، مشیئةً) واتای "ویست" دەگەیەنن و لەو وشانەن کە بە زۆری لە قورئانی پیرۆزدا بەکارهاتوون. خۆ پەیوەندیی "ویستی خوای گەورە" بە "قەدەر"ەوە دووریەکی تر دەهاوێتە سەر "قەدەر".

ئەسڵی ڕوودانی هەموو بەسەرهاتێك و پەیدابوونی هەموو شتێك بریتییە لە ویستی خوای گەورە.

قورئانی پیرۆز لە گەڵێ ئایەتی خۆیدا ئەم ڕاستییەمان یاد دەخاتەوە. وا هەندێکیان لێ باس دەکەین.

أ- ﴿وَلاتقُولَنَّ لِشَيءٍ إنّي فاعلٌ ذلكَ غداً * إلاّ أن يشَاءَ اللهُ واذْكُر ربَّكَ إذا نَسِيتَ وَقُل عَسى أن يَهدِيَنِ رَبّي لأقرَبَ من هَذا رشَداً﴾(الكهف:٢٣-٢٤).

بەو واتایەی کە: هەرکات بڕیارت دا کارێك بکەیت، دەبێ لە پێشدا ویستی خوای گەورە بکەیت بە بناغەی کارەکەت و بیبەستیت بە ئیرادەی خواوەندەوە. لە ڕاستیشدا گەر خوای گەورە ویستی لەسەر هەر شتێك نەبێت، هەرگیز تۆ ناتوانیت ئەنجامی بدەیت. کەواتە دەبێ مرۆڤ هەمیشە بەم جۆرە بیر بکاتەوە و دەست بە هەموو کارێك بکات.

بە بۆنەی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ئەم ڕووداوەی خوارەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە:

(حەزرەتی سولەیمانی کوڕی داوود - درוودی خوایان لەسەر بێت - فەرمووی: دەبێ ئەمشەو بڕۆمە لای هەر سەد خێزانەکەم تاکو هەریەکەیان کوڕێکی ببێت لە پێناوی خوادا غەزا بکات. مەلائیکەت پێیوت: بڵێ: "إن شاء الله" کەچی حەزرەتی سولەیمان لە بیری چوو نەیوت. کاتێ کە ڕۆشتە لای خێزانەکانی، هیچیان منالیان نەبوو، یەکێکیان نەبێت کە منالێکی نیوە ئادەمیزادی بوو! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: گەر بیوتایە: "إن شاء الله" سوێندەکەی نەدەکەوت و باشتریش بوو بۆ هاتنەدیی خواستەکەی)[1].

---

(١) البخاري: النكاح ١١٩، الجهاد ٢٣. هەروەها: المسند لإمام أحمد: ٢/٢٢٩،٢٧٥،٥٠٦.

بەڵێ، دەبێ مرۆڤ باوەڕێکی تەواو دامەزراوی هەبێت بەوەی کە هیچ کەسێك ناتوانێت هیچ کارێك ئەنجام بدات گەر خواوەند "ویستی" لەسەری نەبێت. کەواتە ئەو مرۆڤەی لە لایەنە ڕواڵەتی و پەنهانەکانی شتان تێدەگات و دەتوانێت گوێ لە جیهانی ناوەوەی خۆی ڕابگرێت، باوەڕ بەم ڕاستییە دەهێنێت و دەشبێت باوەڕی پێ بکات. بە چەشنێك کە تەنانەت بە ئەندازەی گەردیلەیەکیش پێچەوانەی ئەم ڕاستییەی بە دڵدا نایەت.

ئێمە کاتێ بۆ شتان و ڕووداوەکان دەڕوانین و پەیوەندییان پێوە دەکەین، بە یەقین و دڵنیاییەوە هەست دەکەین و دەبینین کە ناتوانین تەنانەت یەك دانە پووشی بچووکیش لە جێی خۆیدا هەڵبگرین، گەر خوای گەورە ویستی لەسەری نەبێت. بەڵکو کاتی وا هەیە هەموو پێشەکییەکان ئامادە دەکەین و بیر لە هەموو لایەن و ڕووەکانی مەسەلەکە دەکەینەوە و بەو پێیە نەخشە و پلانەکانی بۆ دادەڕێژین، هەتا وامان لێ دێت دەکەوینە ئەو باوەڕەی کە هەموو هەل و مەرجەکانمان جێبەجێ کردبێت، کەچی دەبینین لەبەر گریمانێك کە هەرگیز بە خەیاڵدا نەهاتووە، کارەکەمان سەرەونخوون هەڵدەگەڕێتەوە! بەو واتایەی کە هەموو گریمانەکان بە وردی حسابیان بۆ کرابوو، بەڵام ویستی خوای گەورە پەیوەندیی بەو کارەوە نەکردبوو. واتە گەر خوای گەورە "نەیەوێت" ئەو شتە بێتەدی بەو جۆرەی ئێمە دەمانەوێت، ئەوا هەرگیزاوهەرگیز نایەتەدی، با هەموو هەل و مەرجە ڕواڵەتییەکانیشی بۆ ئامادە کرابێت. بەم جۆرە هەموو نەخشە و پلانەکانمان بێ ئەنجام دەردەچن. ئەم ڕاستییەش، کە باسمان کرد، ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە تێمان دەگەیەنێت کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَشَاؤُونَ إِلاّ أَن يَشَاءَ اللهُ﴾(الإنسان: ٣٠). واتە گەر هەرچییەکتان هەیە بەختی بکەن و گشت ویستێکی خۆشتان بخەنە کار، ئەوا هەر تەنها ویستی خوای گەورە لەو کارەدا دەستبەکارە، چونکە هەموو ویست و هەوڵەکانتان هیچ جێگایەك ناگرێت گەر ویستی خواوەند پەیوەندی بە ئەنجامدانی ئەو کارەوە نەکات، بەڵام زۆر جار خوای گەورە بەزەیی پێماندا دێتەوە و هۆکارەکانمان لێ وەردەگرێت کە خۆی کردوونی بە مەرجێکی عادی بۆ بەدیهێنانی شتان و، ویستی مرۆڤیشمان لێ گیرا دەکات کە وەك "دوعا" وایە. بەم جۆرە ویستی خوای گەورە پەیوەندی بە هەموو شتێك و بە هەموو بەشەکانی گشت ڕووداوێکەوە دەبەستێت، کەواتە بە تەواوی لەگەڵ ئەو ڕووداوانەدا تێکەڵ بوون.

"ویستی خوای گەورە" لە هەموو ڕووەکانی ژیان و گشت لاپەڕەکانی ژینی مرۆڤدا خۆی دەردەخات، هەروەك ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە دەری‌دەبڕێت:

ب - ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ مِنْهُمْ مَنْ كَلَّمَ اللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا اقْتَتَلَ الَّذِينَ مِنْ بَعْدِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَلَكِنِ اخْتَلَفُوا فَمِنْهُمْ مَنْ آمَنَ وَمِنْهُمْ مَنْ كَفَرَ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا اقْتَتَلُوا وَلَكِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ﴾(البقرة:٢٥٣).

كەواتە گەر "ویستی خوا" نەبوایە هەرگیز نەتاندەتوانی هیچ كردارێك ئەنجام بدەن. بۆ نموونە: گەر خوای گەورە ویستی لەسەر نەبوایە لەگەڵ یەكتردا نەدەجەنگان، خۆ مادەم لەناو خۆتاندا بەشەڕدا دێن و دەجەنگێن ئەوا هەموو كردارە ئیجابی و سەلبی‌یەكانتان بە ویستی خوای گەورەوە گرێ دراون و هەر شتێك ویستی ئەوی لەسەر بێت دێتەدی و لەسەر ئەو كارانەش كە ئەنجامیان دەدات پرسیاری لێ ناكرێت، هەروەك لەو كارانەی كردوونی و دەیانكات پرس و ڕا بە كەس ناكات.

ئەم فەرموودە پیرۆزەی كە دێت دەستوورێكی بڕیاردراوە كە دەفەرموێت:

"ما شاءَ اللهُ كان وما لم يشأ لم يكـــن"(١). هەر شتێك خوای گەورە بیەوێت و ویستی لەسەری بێت، دەبێت و دێتە وجوود. هەر شتێكیش ویستی لەسەر نەبوونی بێت، نابێت و نایەتە وجوود.

شتێكی سەرنجڕاكێش لێرەدا هەیە، ئەویش پەیوەندی كردنی ویستی خوای گەورەیە بە "عەدەم"ەوە! هەر بۆیە ئەو شتەی خوای گەورە ویستی لەسەر "نەبوون"ی بێت، نابێت و "بوون" بە خۆیەوە نابینێت.. هەروەك ویستی لەسەر "بوون"ی هەر شتێك بوو، دێتە وجود و "بوون"ی پێ دەبەخشرێت. بەڵێ، ویستی خوای گەورە پەیوەندی بە "وجوود" و "عەدەم"ەوە دەكات و، بەو جۆرە نی‌یە كە هەندێ لێی تێ گەیشتوون گوایا: ویستی خوای گەورە گەر پەیوەندی بە شتێكەوە بكات ئەو شتە دەبێت و دێتە وجوود، بەڵام گەر پەیوەندیی پێوە نەكات نابێت و نایەتە وجوود. نەخێر، ئەم بۆچوونە هەڵەیە. چونكە هەرگیز شتێك لە گۆڕێدا نی‌یە كە پێی بوترێ: "پەیوەندی نەكردنی ویستی خوای گەورە". لەبەر ئەوەی چ "وجوود" و چ "عەدەم" هەردووك لەناو دەستی ویستی خوای گەورەدان!

خۆ ئەگەر "موعتەزیلە" و "جەبریيە" لە ناوەڕۆك و واتا وردەكانی فەرموودەكەی پێشوو تێبگەیشتنایە، ئەوا نەدەكەوتنە ئەو هەڵە گەورە و زەقانەی كە دووچاری بوون، چونكە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ هەردوو كارەكە بە فیعلی: "كَینونة" لێك دەداتەوە.

---

(١) رواه أبو داود: الأدب ١٠٦.

هەروەها تەنها ئەم "ویست"ەی خوای گەورەیە کە لە مەسەلەی ئیمان و هیدایەتدا هەموو شتێك دەبڕێتەوە. ئەوەتا ئەو کەسانەی کە لەم گۆشەیەوە دەڕوانە ئەم مەسەلەیە، دەڵێن: "ئیمان" نوورێکە خوای گەورە دەیهاوێتە ناو دڵی هەرکام لە بەندەکانیەوە، دوای ئەوەی کە ئەو بەندەیەی جوزئی ئیختیاریی خۆی خستە کار. بەو واتایەی کە تۆ هەوڵ و تێکۆشانت دەخەیتە کار و خواوەندیش بۆت بەدیدەهێنێت.

بەڵێ، تۆ ناتوانیت ئەو نوورە لە خۆتدا دابگیرسێنیت و تا ئەبەد بە بەردەوامی بیهێڵیتەوە، بەڵکو هەر تەنها خوای گەورەیە کە - ئەگەر ویستی لەسەری بێت - دایدەگیرسێنێت و دڵی تۆی پێ ڕووناك دەکاتەوە. بەڵگەش لەسەر ئەمە، ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە دەفەرموێ:

ج - ﴿وَلَو شَاءَ رَبُّكَ لآمَنَ مَنْ فِي الأَرضِ كُلُّهُم جَمِيعاً أَفَأَنتَ تُكرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾(يونس:٩٩).

واتە: ئەو کەسەی کە پەروەردەی کردوویت و گەیاندوویتیە پلەی "کەماڵ" و فەرمانڕوایە بەسەر هەموو شتێکدا، گەر بیەوێت، هیدایەتی هەموو خەڵکی دەدات.

ئایەتێکی تر لەم بارەیەوە هەیە کە بریتییە لە:

د - ﴿وَإِنْ كَانَ كَبُرَ عَلَيكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنْ استَطَعْتَ أَنْ تَبتَغِيَ نَفَقَاً فِي الأَرضِ أَو سُلَّماً فِي السَّمَاءِ فَتَأْتِيَهُمْ بآيَةٍ وَلَو شَاءَ اللهُ لَجَمَعَهُم عَلَى الهُدَى فَلا تَكُونَنَّ مِنَ الْجَاهِلِينَ﴾(الانعام:٣٥).

ئەم بێدارکردنەوەیەی خواوەند بۆ خودی پێغەمبەر ﷺ لە ڕاستیدا بێدارکردنەوەیە بۆ هەموو خەڵکی سەبارەت بە هەر شێوەیەکی لەڕێترازان لە مەسەلەی قەدەردا.

بەڵێ، گەر پەروەردگاری تۆ بیویستایە: هیدایەتی هەموویانی دەدا و.. هەموویان سوژدەیان بۆ دەبرد و.. هەموو خەڵکی خاوەنی ویژدان و دڵ و دەروونی ڕووناك دەبوون و.. شەرەفمەندی بەندایەتیی بێ گەردیان بۆ خوای گەورە بەدەست دەهێنا و.. بە "ئیمان" و "ئیسلام" ڕێزیان لێ دەگیرا. بەڵام "ویستی خوای گەورە" لەسەر غەیری ئەمەیە، بۆیە پەیوەندیی بە "بەدیهێنان"ی ئەم جۆرە شتانەوە نەکردووە و نەیهێناونەتە دی.

هـ - ﴿وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنْكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً وَلَوْ شَاءَ اللهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَكِنْ لِيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُم فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ إِلَى اللهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾(المائدة:٤٨).

بەڵێ، گەر پەروەردگارمان ویستی لەسەر بوایە ئەوا هەموو گرۆی مرۆڤی دەکرد بە یەك نەتەوە، بەڵام ویستی خواوەند لەسەر ئەوە بووە کە ببن بە چەند نەتەوەیەکی

جیاجیا، بۆیە نەتەوەكان بەم جۆرە و جیاجیا بۆ مەبەستی تاقیكردنەوە بەدیهێنراون.
سەبارەت بەوەش كە فەرمانڕەوایی دەوڵەتەكان و بەردەوامبوونیان و بە دوای یەكدا هاتنی كاربەدەستەكانی ئەم دەوڵەتانە هەموو بەپێی ویستی خواوەندن، ئەوا ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە ڕوونی دەكاتەوە:

و - ﴿إِنْ يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ مِثْلُهُ وَتِلْكَ الأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَيَتَّخِذَ مِنْكُمْ شُهَدَاءَ وَاللهُ لا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ﴾(آل عمران:١٤٠).

ئەم ئایەتە پیرۆزە "ویستی خوای گەورە" دەردەخات، هەرچەندەش بە ڕاشكاوی ئەم وشەیەی بەكار نەهێناوە، چونكە فەرمایشتی: ﴿وَتِلْكَ الأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا﴾ بە ڕوونی دەری‌دەخات كە ئاڵوگۆڕی بارودۆخ و هەلوێست و قۆناغەكانی خەڵكی، تەنها بە فەرمانی خواوەند دەبێت و لە دەستی ئەودایە و ڕۆژگارەكان یەك لە دوای یەك بەوپەڕی ئاسانی لە دەستی خوای گەورەدا ئاڵ و گۆڕیان پێ دەكرێت.

جا كاتێ كە ئێمە باسی هەموو ئەمانە دەكەین، ئایا نەفیی "ویستی مرۆڤ"یان تێدا كراوە؟ نەخێر. بەڵام ئێستا لەو بابەتە نادوێین، چونكە لێرەدا ئەو ئایەتانە دەهێنین كە پەیوەندی‌یان بە "ویستی خوای گەورە"وە هەیە.

جگە لەمانەی پێشوو، ئایەتێكی تر لەم بارەیەوە هەیە:

ز - ﴿إِنْ يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ أَيُّهَا النَّاسُ وَيَأْتِ بِآخَرِينَ وَكَانَ اللهُ عَلَى ذَلِكَ قَدِيراً﴾(النساء:١٣٣).

بەڵێ، خوای گەورە دەتوانێت ئێوە لەناو بەرێت و لە بریی ئێوە كەسانی تر بهێنێت. هەروەك هاوەڵەكانی لابرد و ئەمەویەكان و پاش ئەوان عەبباسی‌یەكان و پاش ئەوانیش سەلجووقی‌یەكان و پاشان عوسمانی‌یەكانی هێنا، ئنجا ئەوانیشی لابرد و، ئێستا ئەمانەتە گەورە و میراتە موقەددەسەكە چاوەڕوانی دەستپاكانی نوێیە تاكو هەڵی بگرن. ئایا دەبێ ئەوانە كێ بن كە دەستی باڵایان لەم بوارەدا هەیە؟ ئایا بەشی "زیرەكی" و "ژیری" لەم مەیدانەدا چەندەیە؟ چەند كەس لەوانە هەوڵیان داوە بێ ئەوەی شكست بهێنن و ڕەنجەڕۆ بن؟

جا ئەو یاسا خوایی‌یەی كە هەرگیز ئاڵوگۆڕی بەسەردا نایەت، بریتی‌یە لە: مەودای پارێزگاری كردنی ئەو كەسانە بۆ هەل و مەرجە ئاسایی‌یەكان، كە بریتین لە هۆكارەكان و، ویستی خواوەند دایناون. چونكە چاودێری و پارێزگاری كردنی ئەو هەل و مەرجانە گەلێ گرنگن بۆ "مانەوە" و "هەڵگرتن"ی ئەركی ئایین و داكۆكی لێكردنی.

دەتوانین لەم ڕووەوە گەلێ نموونەی مێژوویی بۆ بەرزبوونەوە و شکستی نەتەوەکان بهێنینەوە، بەڵام نامانەوێت باسیان بکەین، تاکو سنووری مەسەلەکەی خۆمان نەشکێنین.

بەڵێ، گرنگترین کێشە لە ڕووی زەوی‌دا بریتی‌یە لە "پارێزگاری کردنی ئایین" چونکە هەر تەنها ئایینە کە ئامانج و ئەنجامی ژیانی ڕوون کردووەتەوە و هەر ئەویشە کە باشترین بناغە و دادگەرترین تەرازووی بۆ پەیوەندی‌یەکانی نێوان خەڵکی داناوە[1]. جا پارێزگاری کردنی ئەم پەیوەندی‌یانە، نەك هەر تەنها ژیان و بوونی خەڵکی، بەڵکو باشترین و تەواوترین جۆری ژیانیشیان بۆ دەستەبەر دەکات.

بەڵام هاندانی خەڵکی بۆ سڕینەوەی ماهییەتی ڕاستەقینە و سروشتی خۆیان و، دوورخستنەوەیان لە کەسایەتیی زاتی‌یان و، تواندنەوەیان لە قالبی چەند سیستەمێکی بیانی و چەند ڕۆشنبیری‌یەکی نامۆدا سەبارەت بەوان، ئەم کارە لە هەموو وزەیەکی زاتیی خۆیان دایاندەماڵێت و دەیانخاتە سواڵکردن لە بەردەرگای کەسانی تردا! لە کاتێك‌دا کە دەزانین سەرچاوەی هەموو ڕەوشتێکی جوان و کردار و ڕەفتارێکی باش و چاك تەنها هەر ئایینە. خۆ هەرچەند مرۆڤ لە ئایین دوور بکەوێتەوە، هەمیشە لە ناخی خۆی‌دا هەست بەو بۆشایی‌یە دەکات کە نەمانی ئایین دروستی کردووە. هەر نەتەوەیەکیش لە ئایین دوور بکەوێتەوە و پشتی تێ بکات بینای ماددی و مەعنەویی لە بن هەڵدەوەشێت و سەرەوژێر دەبێت.

دەوڵەتە کافرەکان لەوانەیە ببن بە خاوەنی ئابووریی بەهێز. بەڵام هیچ نەتەوەیەکی خاوەن ئایین، کە پشتی لە ئایینەکەی هەڵ کردبێت، هەرگیز ناتوانێت بە بێ ئایین ئەو چەشنە ئابووری‌یە بەهێزە بەدەست بهێنێت. چونکە چاودێریی بەشێکی ئەو هۆکارانەیان نەکردووە کە "ویستی خوای گەورە" وەك مەرجێکی سەرەکی بۆ ژیانی ئەوانی داناوە. ئەم ئایەتەی خوارەوە ئەم حاڵە ڕوون دەکاتەوە:

ح - ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمنوا مَنْ يَرتَدَّ مِنكُم عَن دِينِه فَسَوفَ يَأتِي اللهُ بقَومٍ يُحِبُّهُم وَيُحِبُّونَهُ أذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤمِنِينَ أعِزَّةٍ عَلى الكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللهِ وَلا يَخَافُونَ لومَةَ لائِمٍ ذلِكَ فَضْلُ اللهِ يُؤتِيهِ مَن يشَاءُ واللهُ واسِعٌ عَلِيم﴾(المائدة:٥٤).

وشەی: "إرتدَّ، يرتَدَّ" واتای گەڕانەوە بەرەو دواوە دەگەیەنێت، واتە گەڕانەوە و پاشگەزبوونەوە لە ئایین. قورئانی پیرۆز، کە بەم وشەیە لەگەڵ هەموو ئیماندارێك

(١) ئاشکرایە کە مەبەست بە "ئایین" لێرەدا ئایینی ئیسلامە، کە تاکە ئایینە ئەو تایبەتکاری‌یەی تێدایە نووسەر باسی دەکات. (وەرگێر)

دەدوێت، هەموو واتاکانی ئەم وشەیەی مەبەستە. وەك: هەڵگەڕانەوە لە بیروباوەڕ.. لە کردەوە.. لە تەسەوور.. لە بیرکردنەوە. هەروەك چەندەها واتای زۆری تریشی لەخۆ گرتووە.

هەر کەسێك - یان هەر کۆمەڵێك - کە لە ژیانی ئایینیدا گەیشتبێتە ئاستێکی تایبەتی و بوو بێت بە بەشێك لە بانگەوازی خەڵکی بۆ لای خوای گەورە، کاتێ خۆی لە بەردەم ئەم ئایەتە پیرۆزەدا دەبینێتەوە هەست دەکات ئایەتەکە هەڕەشەی لێ دەکات کە نەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی پێش ئیمانەکەی. چونکە ئەو قۆناغانەی کە ئەو کەسە - یان ئەو کۆمەڵە - بڕیویانە تەنها لوتفێکی خوای گەورەیە و، ئەگەر چ تاك و چ کۆمەڵ جڵەوی بەردەوامبوونیان لەسەر کارەکەیان شل بکەن و نەتوانن پارێزگاریی خۆیان بکەن و، پاشە و پاش بەرە و دواوە بگەڕێنەوە، ئەوا خوای گەورە ئەم بانگەوازەیان لێ دەسێنێتەوە و بە "کەس"ێك یان "کۆمەڵ"ێکی تری دەسپێرێت!

هەروەها گەر "دەوڵەت"ێك ئایینی کردبێت بە گیانی "ژیان" و، ئەم فەرمانەی جێبەجێ کردبێت، ئەوا ڕووی گوفتاری ئەم ئایەتە سەرجەمی نەتەوەکە دەگرێتەوە و هەڕەشەکەش ڕووی لە هەموویانە. چونکە هەر نەتەوەیەك خواوەند عیززەت و سەربەرزیی لەبەر ئەوە پێ بەخشیبێت کە ئایینیان کردبێت بە مایەی ژیانیان، گەر ئەو نەتەوەیە دەست لەم ئایینە هەڵبگرن کە خوای گەورە بەهۆیەوە سەری بەرز کردوونەتەوە، ئەوا بێ گومان سەرنخوون دەبن و خوای گەورە لە بریی ئەوان "سەربەرزی" بە نەتەوەیەکی تر دەدات.

لە وشەی ﴿قَوْمٍ﴾دا "تەنوینی تەنکیر" ڕەچاو دەکرێت! واتە هەر قەومێك بێت، کە لەوانەیە خەڵکی نەیانناسن و بە خەیاڵیاندا نەیەت و نەزانن کەی و بە چ بارودۆخێك دێن و پەیدا دەبن، بەڵام وەسفەکانیان دیارە. کەواتە هەموو قەومێك پێشبڕکێ دەکەن و هەوڵ دەدەن ئەو قەومە بن کە خوای گەورە ستایشی کردوون. جا هەروەك هیچ قەومێك ناتوانێت لافی ئەوە لێ بدات کە بڵێت: مەبەستی ئایەتەکە ئێمەیە، هیچ کامیشیان لەوە نائومێد نابێت کە ئەو وەسفانە لە خۆیدا بهێنێتەدی.

وەسفەکانی ئەو قەومە ئەمانەی خوارەوەن:

سیفەتی یەکەم: ﴿يُحِبُّهُمْ﴾ واتە: "خوای گەورە خۆشی دەون". چونکە خواوەند دڵی خەڵکی وا لێ دەکات کە گومانی باشیان بەوان هەبێت. حەزرەتی ئەبوو هورەیرە - خوای لێ ڕازی بێت - لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: "گەر خوای گەورە بەندەیەکی خۆش ویست بانگ لە جوبریل دەکات: خوای گەورە فلان بەندەی

خۆش دەوێت تۆیش خۆشت بوێت. ئیتر جوبریلیش خۆشی دەوێت و ئنجا بانگ لە ئەهلی ئاسمان دەکات و دەڵێت: خوای گەورە فلانە کەسی خۆش دەوێت دەسا ئێوەش خۆشتان بوێت، بەم جۆرە ئەوانیش خۆشیان دەوێت و، ئنجا لەسەر زەوی‌ش‌دا قبوولی لە دڵی خەڵکی‌دا بۆ دادەنرێت"[1]. ئەو کاتە هەموو خەڵکی سەیری چاوی ئەوان دەکەن و قسەکانیشیان لە دڵی ئەواندا کاریگەریی دەبێت و، تەنانەت هەر پێشنیارێك ئەوان بیکەن لای خەڵکی بە ئەمر و فەرمان وەردەگیرێت و، گەر هەر فەرمانێکیش دەربکەن یەکسەر جێ‌بەجێ دەکرێت و لە دڵ و ویژدانی خەڵکەکەدا جێگیر دەبێت.

سیفەتی دووهەم: ﴿يُحِبُّونَهُ﴾ واتە: "خوای گەورەیان خۆش دەوێت". بێ گومان نیشانەی ئەوەی کە خوا خۆشی دەون. بریتی‌یە لەوەی کە ئەمان خوای گەورەیان خۆش دەوێت. چونکە هەر کەسێك بە هەر ئەندازە و ڕێژەیەك خوای گەورەی خۆش بوێت ئەوا بە هەمان ڕێژە لای خوای گەورە خۆشەویست دەبێت.

سیفەتی سێ‌هەم: ﴿أَذِلَّةٍ على المؤمنين﴾. واتە: سەرجەمی ئیمانداران لە خۆیان بە باشتر دەزانن و دوودڵ نین لەوەدا کە سەریان بخەنە ژێر پێی ئیمانداران. خۆ هەتا بەم جۆرە لە پێناوی خوادا تەوازوع و نەوازش و خۆنەویستی بنوێنن، خوای گەورەش پتر سەربەرزی‌یان پێ‌دەبەخشێت.

سیفەتی چوارەم: ﴿أعِزَّةٍ على الكافرين﴾. واتە: سەبارەت بە کافرانەوە سەریان بڵندە و لە بەردەمیاندا ملیان بۆ نەوی ناکەن. بەڵکو لە جیهادی بەردەوامدا دەبن لەگەڵیاندا. هەتا چەندە بۆ ئیمانداران تەوازوع بنوێنن، هەر بەو ئەندازەیەش بەسەر کافراندا سەریان بڵندە.

سیفەتی پێنجەم: ﴿يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللهِ﴾. واتە: لە هەموو شوێن و جێگایەکدا و بەپێی بارودۆخی ئەو شوێن و جێگایانە، بە بەردەوامی هەر لە جیهاددا دەبن. چونکە ئەم ڕستەیە "جوملەی فیعلی"یە بەردەوامی و تازەبوونەوە دەگەیەنێت. واتە هەمیشە بە فیراسەت و بەصیرەت هەنگاو دەنێن و ڕەفتار دەکەن.

سیفەتی شەشەم: ﴿وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لائم﴾. واتە: جگە لە خوای گەورە ترسیان لە هیچ کەسێکی تر نی‌یە و حساب بۆ قسەی کەسانی تر ناکەن و گوێی پێ نادەن، چونکە تەنها بیر لە "ڕەزامەندیی خوای گەورە" دەکەنەوە.

**بەڵێ، ئەم سیفەتانەن کە لەو کۆمەڵە میسالی‌یەدا دێنەدی. جا هەر کۆمەڵێك ئەم سیفەتانەیان تێدا بەرجەستە بوو، ئەوا خوای گەورە ئەمانەتە موقەددەسەکەیان**

(١) البخاري: بدء الخلق ٦. مسلم: البر ١٥٦.

دەخاتە ئەستۆ. ئەمەش یاسایەكی خوایی‌یە و هەرگیزاوهەرگیز ئاڵوگۆڕی تێدا نەبووە و نابێت. گەر ئەم سیفەتانە لە عەرەبدا بێنەدی ئەمانەتەكە دەگرنە ئەستۆ.. گەر لە توركدا بێنەدی ئەو ئەمانەتەیان پێ دەبەخشرێت.. بە هەمان جۆر كورد و.. بۆشناق و.. ئەلبان.. هەر قەومێك ئەم سیفەتانەیان تێدا بێت ئەوا شایستەی هەڵگرتنی ئەمانەتەكە دەبن.

ئایەتێكی تر هەیە كە چەندین بناغە و دەستووری گشتی و هەمەلایەنەی لەخۆ گرتووە كە ئەمەی خوارەوەیە:

ط - ﴿قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاءُ وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾(آل عمران:٢٦).

بەڵێ، هەر نەتەوەیەك خاوەنی نوێنەرێك نەبێت كە نوێنەرایەتیی بكات ئەوا ئەو نەتەوەیە پارچەپارچەبوون و شپرزەیی چارەنووسیەتی. ئەگەر پادشایانیش دڵیان بە خواوەند و خاوەنی ڕاستەقینەی خۆیانەوە نەبەستن، ئەوا نەتەوەكانیان ماوەیەكی كەم دەمێننەوە و لەسەر پێ ڕادەوەستن.

وەك بڵێی لێرەدا - لە لایەكەوە - زەلیلی‌یەك دەبینرێت بەهۆی ئەوەی "ویست" پێش‌چاو نەخراوە و، لە لایەكی تریشەوە وەك ئەوە وایە كە بڵێت: "مانەوە" تەنها بەهۆی "ویست"ەوە بەدەست دەهێنرێت. كەواتە ئەو ویستەی كە دەردەكەوێت و پێش‌چاو دەخرێت دەبێ بە نیشانە لەسەر فەرمانڕەوایەتیمان و، پارێزگاری كردنیشمان لەو فەرمانڕەوایەتی‌یە تەنها بەوە دەبێت كە لە هەموو كردارێكدا هانا و پەنا بۆ لای خوای گەورە بەرین.

بەم جۆرە دەردەكەوێت كە دۆزینەوەی ئەم "هاوسەنگی"یە پابەندە بە پەی‌بردنی تەواوەتی بە: "قەدەر" و "ویستی جوزئی" و "ویستی خوایی" بە تایبەتی كە ناوی "بوعدی سێ‌هەمی قەدەر"مان لێ نا.

لەم ئایەتە پیرۆزانەوە كە باس كران، لەوە تێ‌گەیشتین و بۆمان دەركەوت كە: "ویستی خوایی" دەوراندەوری هەموو شتێكی گەورە و بچووكی ژیانی داوە، كەواتە ویستی خواوەند هەموو شتێكی گرتووەتەوە، تەنانەت "عەدەم"یش بریتی‌یە لە دەروشانەوە و دەركەوتنی ویستی خواوەند لەو ڕووەدا، چونكە خوای گەورە: ﴿فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴾ (البروج :١٦).

لەبەر ئەوە، هەرگیز ناگونجێ هیچ شتێك بە بێ "ویست"ی خوای گەورە پەیدا ببێت.

دەبێ ئەوەش بزانین کە "ویستی خوایی" هەندێ جار لە شێوەی سۆز و میهرەبانیدا و هەندێ جاری تریش لـە شێوەی ئازار و سزادا دەردەکەوێت، هەریەکەیان لـە شوێنی خۆیدا. ئەم ئایەتە پیرۆزانەی خوارەوە ئەممان بۆ ڕوون دەکەنەوە:

ی - ﴿ربُّكم أعْلَمُ بكُم إنْ يَشأْ يرْحَمْكُم أو إنْ يَشأْ يُعَذِّبْكُم ومَا أرسَلنَاكَ عَلَيهِم وَكِيلاً﴾(الاسراء:٥٤).

﴿ولَقَدْ خَلَقنَا الإنسَانَ ونَعلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفسُهُ ونَحْنُ أقْرَبُ إليهِ مِن حَبلِ الوَريدِ﴾(ق:١٦).

﴿لله مَا في السَّموات ومَا في الأرضِ وإنْ تُبْدُوا مَا في أنْفُسِكُم أو تُخفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ الله فَيَغْفِرُ لِمَنْ يشَاءُ ويُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ والله عَلى كُلِّ شَيءٍ قَدِيرٌ﴾(البقرة:٢٨٤).

بەڵێ "ویستی خوایی" هەمیشە سروودی سەر زاری پێغەمبەران بووە، درووودیان لەسەر بێت. قورئانی پیرۆز شایەتە لەسەر ئەمە:

ك - ﴿قُلْ لا أمْلِكُ لِنَفسِي نَفعاً ولاضَرّاً إلاّ مَا شَاءَ الله ولَو كُنتُ أعلَمُ الغَيبَ لاستَكثَرتُ مِنَ الخَيرِ ومَا مَسَّنِي السُوءُ إنْ أنَا إلاّ نَذيرٌ وبَشيرٌ لِقَومٍ يُؤمِنُونَ﴾(الاعراف:١٨٨).

بەو واتایەی کە: "ویستی خوایی" بناغەی هەموو شتێکە، تەنانەت خۆیشم خاوەنی سوود و زیانی خۆم نیم چ جای هی خەڵکی، مەگەر خوای گەورە خۆی ویستی لەسەری بێت.

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بە تەواوەتی و یەکجارەکی خۆی تەسلیمی "ویستی خوایی" کردبوو، بە ڕادەیەك کە فەرموویەتی: (لە یەکتر نزیك ببنەوە و لەگەڵ یەکدا ڕاست بن، ئەوەش بزانن کە هیچ کەس لە ئێوە کردەوەکەی ڕزگاری ناکات) هاوەڵەکان عەرزیان کرد: تۆیش ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: (منیش، مەگەر خوای گەورە سۆز و فەزڵی خۆیم فریا بخات)[1]!

ئا ئەمەیە تەرازووی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لە بەردەم "ویستی خوایی"دا و، ئا بەم جۆرەش تێمان دەگەیەنێت و فێرمان دەکات. کەواتە دەبێ هەموو کەسێك خۆی و کردەوەکانی بەم تەرازووە هەڵبسەنگێنێت. بەڵێ، گەر پێغەمبەر ﷺ لە بەردەم "ویستی خوایی"دا بەم جۆرە بێت، دەبێ کەسانی تر چۆن بن؟

---

(١) رواه مسلم: صفات المنافقين ٧٦.

ئەو کەسانەی کە هەردەم دەڵێن: کردەوەی چاکی زۆرمان ئەنجامداوە، جا ئەگەر ئێمە نەچینە بەهەشت ئایا کێی تێدەچێت؟.. ئەو کەسانەی کە ئەمە و گوفتارەکانی تری وەك ئەمە لە زاریان دەردەچێت، کە جۆرە گوفتارێکە لەخۆباییبوون و خۆ بە گەورە گرتنیان پێوە دیارە.. ئامۆژگارییان دەکەین کە هەردەم فەرموودە پیرۆزەکەی پێشوو لەگەڵ ڕەفتارەکەی پێغەمبەر ﷺ لە بەردەم "ویستی خوایی"دا، بکەن بە نموونە و پێشڕەوی خۆیان. واتە: ملکەچبوون بۆ ویستی خوای گەورە مرۆڤ لە "کیبر" و "غروور" ڕزگار دەکات. کەواتە ئیماندار ناچارە کە "ویستی خوایی" بکات بە بناغەی هەموو کارێکی، چونکە هەر ئەو ویستەیە کە دەورانەدەوری ڕووی ئاشکرا و پەنهانی هەموو شتێکی داوە و، هیچ شتێك نییە کە لە دەرەوەی ئەو ویستەوە بێت. بێ گومان پەیبردن بە "ویستی خوایی" بەپێی ئەو تەرازووانەی کە پێویستن، لە ڕاستیدا پێویستیی بە ئاستێکی دیاری کراوی زانیاری دەبێت و، گەر کەسێك نەگەیشتبێتە ئەم ئاستە گەلێ دژوارە بە تەواوەتی لە "ویستی خوایی" تێ بگات، بەڵکو هەر مەحاڵە بتوانێت پەیی پێ بەرێت. چونکە ئایا هەر ئەم مەسەلەیە یەکێك نەبوو لەو مەسەلانەی کە ئەو کۆمەڵانەی پێغەمبەرانیان - علیهم السلام - بۆ ڕەوانە کرا نەیانتوانی بە تەواوەتی لێی تێ بگەن و، لە ئەنجامدا بەرەنگاری پێغەمبەرەکانیان بوونەوە؟!

قورئانی پیرۆز لە سەدان ئایەتیدا ڕووە جۆراوجۆرەکانی "ویستی خوایی" ڕوون دەکاتەوە و لە بەسەرهاتی پێغەمبەران - علیهم السلام - و نەتەوەکانیاندا گەلێ نموونەی لەسەر دەهێنێتەوە. مەسەلەی "ویستی خوایی" لە قورئانی پیرۆزدا لە زۆر ڕووی وەك: ڕووی بیروباوەڕ و، ڕووی تەسەوور و، ڕووی کردەوە و، چەندین ڕووی ترەوە باس کراوە.

حەزرەتی نووح - درودی لەسەر بێت - نموونەیەکی ئاشکرای ئەم مەسەلەیەیە. چونکە قورئانی پیرۆز باسی ئەوانە دەکات کە بەرەنگاری حەزرەتی نووح بوونەتەوە و گاڵتەیان بە هەڕەشەکانی کردووە، ئەوەتا قسەکانی ئەوان دەهێنێت و دەفەرموێ:

ل - ﴿قَالُوا يَا نُوحُ قَدْ جَادَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَالَنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِنْ كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾(هود: ٣٢).

حەزرەتی نووحیش بەمەی خوارەوە وەڵامی دانەوە:

﴿قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ اللَّهُ إِنْ شَاءَ وَمَا أَنتُمْ بِمُعْجِزِينَ ۞ وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِي إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِنْ كَانَ اللَّهُ يُرِيدُ أَنْ يُغْوِيَكُمْ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾(هود:٣٣-٣٤).

بەم جۆرە، حەزرەتی نووح - دروودی لەسەر بێت - لەم وەڵامەی‌دا ئاماژە بۆ ئەو ڕاستی‌یە دەکات کە: "ویستی خوای گەورە" لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە. وەك بیەوێت پێیان بفەرموێ: من ئەو کەسە نیم کە ئەو سزایەتان بە سەردا دەبارێنێت. خۆ ئەگەر من بمتوانیایە سزای کەسێك بدەم ئەوا هیچ کەسێك پرکێشیی نەدەکرد ڕەخنەم لێ بگرێت و لە قسەم دەربچێت و، لە هەمان کات‌دا نهێنیی "تاقیکردنەوە"ش دەدرا بە بادا. بەڵام ئێوە بەهۆی خستنەکاری ئەو "ویستە جوزئی"یەی کە پێتان دراوە، یان تەسلیمی ئەو ویستەی خواوەند دەبن، یان پشتی لێ هەڵدەکەن. خۆ ئەگەر خوای گەورە بیەوێت بەهۆی نهێنیی "تاقیکردنەوە"وە لە ڕێتان بترازێنێت ئەوا گوفتار و ئامۆژگاریی من - تەنانەت ئەگەر گەوهەری بەنرخیش بن - (کە هەر وەهایشە؛ گوفتاری پێغەمبەران - دروودیان لەسەر بێت - گەلێ لە گەوهەر بەنرخترن) هیچ سوودێکتان پێ ناگەیەنێت، چونکە ویستی خواوەند لە سەرووی هەموو تەقدیر و تەکلیفێکەوەیە. هەر ئەو پەروەردگارتانە و ویستی لەسەر هەر شتێك و بە هەر چۆنێتی‌یەك بێت، ئەو شتە بەو چۆنێتی‌یە دەبێت. هەروەك دەگەڕێنەوە لای خۆی، با خۆشتان نەتانەوێت بگەڕێنەوە لای. من تەنها ئەوەندەم بەدەستە کە بانگ و ئامۆژگاری و ڕێنماییتان بکەم. کەواتە من و ئێوە لە بەردەم "ویستی خوای گەورە"دا یەکسانین.

ئەم ئایەتە پیرۆزە و ئایەتەکانی تری هاوچەشنی، گەلێ هەڵوێستی جۆراوجۆری پێغەمبەرانمان - علیهم السلام - لە بەردەم "ویستی خوایی"دا پیشان دەدەن. ئەوەتا حەزرەتی ئیبراهیمیش - دروودی لەسەر بێت - لە دەمی بانگ‌کردنی قەومەکەی‌دا بۆ "تەوحید" دەچێت "ویستی خوایی"یان تێ‌دەگەیەنێت!

م - ﴿وَحَاجَّهُ قَوْمُهُ قَالَ أَتُحَاجُّونِّي فِي اللهِ وَقَدْ هَدَانِ وَلاَ أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِهِ إِلاَّ أَن يَشَاءَ رَبِّي شَيْئاً وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيْءٍ عِلْماً أَفَلاَ تَتَذَكَّرُونَ﴾(الأنعام: ٨٠).

حەزرەتی ئیبراهیم پێیان دەفەرموێ: من ناترسم لەو شیرك و هاوبەشەی کە ئێوە بۆ خوای دادەنێن، بەڵام لەو شتانە دەترسم کە خوای گەورە ویستی لەسەریان دەبێت. واتە لەوە دەترسم خوای گەورە فەرمانێکم لەسەر دەربکات، دەنا گەر هەموو بوونەوەران بەسەر تەوقی سەری من‌دا بتەقێنەوە، ئەوا هەرگیز ترس و بیم ناخەنە ناو دڵمەوە، چونکە لەو یەقین و دڵنیایی‌یەدام کە هیچ شتێك زیانم پێ ناگەیەنێت، گەر خوای گەورە ویستی لەسەر زیانم نەبێت.

ئەم وانەیەی تەوحید کە حەزرەتی ئیبراهیم - دروودی لەسەر بێت - هێناویەتیەوە، بە ڕوونی جەخت لەسەر "ویستی خوایی" دەکات.

ن - ﴿يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ﴾(الصافات:١٠٢).

ئەمە وەڵامی حەزرەتی ئیسماعیلە - دروودی لەسەر بێت - بۆ پێشنیارەکەی باوکی و یەکسەر دوای ئەوەش فەرموویەتی: ﴿سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ﴾(الصافات:١٠٢) کە بەمەش ئاماژەی بۆ "ویستی خوایی" کردووە. واتە ئارامگرتنی خۆی دەبەستێتەوە بە "ویستی خوای گەورە"وە.

کاتێ لە گەشتە دوو قۆڵییەکەدا حەزرەتی خضر بە حەزرەتی مووسای فەرموو: ﴿إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْراً﴾(الكهف:٦٧) حەزرەتی مووسا - دروودی لەسەر بێت - لە وەڵامدا فەرمووی: ﴿ستجدُني إن شاءَ اللهُ صَابراً ولا أعصي لك أمراً﴾(الكهف:٦٩).

ئا لێرەدا مەودای لەیەکچوونی هەڵوێست و گوفتاری پێغەمبەرانمان - درووديان لەسەر بێت - بۆ دەردەکەوێت. ئەوەتا هەموویان لە هەمان هەست و پەیبردن و تێگەیشتنەوە دەدوێن و هەمان فەرمایشت دووپات دەکەنەوە، چونکە هەموویان وەکو یەك تەسلیمی "ویستی خوایی" بوون.

س - حەزرەتی یووسف - دروودی لەسەر بێت - کاتێ دایك و باوکی دەعوەت کرد بۆ میسر، پێی وتن: ﴿أُدخُلوا مصرَ إنْ شَاءَ اللهُ آمِنِينَ﴾(يوسف:٩٩). دەبینیت ئا لەم کاتەشدا "ویستی خوایی" لە یاد ناکات.

گەر سەیری هەرکام لە پێغەمبەران - عليهم السلام - بکەین، بە ڕوونی "ویستی خوایی" لە زنجیرەی بیروباوەڕەکەیاندا دەبینین. چونکە خواوەند هەموویانی وەك یەك فێری ئەو شتانە کردووە کە پێی ڕاگەیاندوون.

بەڵێ، ویستی خوای گەورە هەموو شتێکە و بناغەی ویستی مرۆڤیشە. ڕەت کردنەوەشی - پەنا بەخوا - شیرك و هاوبەشییە سەبارەت بە پەروەردگارێتییەکەی. واتە ئەوە دەگەیەنێت کە خواوەند خۆی هەندێ لە کاربەڕێ کردنەکانی بە غەیری خۆی بسپێرێت.

* * *

**دووهەم:** "ویستی خوایی" لە فەرموودە پیرۆزەکاندا.

أ - ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە توفەیلی کوڕی سەخبەرەوە - کە برای دایکیی حەزرەتی عائیشەیە - دەگێڕێتەوە کە: لە خەونیدا بە لای کۆمەڵە کەسێکی جوولەکەدا تێپەڕی کردووە و لێی پرسیون ئێوە کێن؟ وتوویانە: ئێمە جوولەکەین.

ئەمیش وتوویەتی: بە ڕاستی ئێوە کۆمەڵێکی باشن گەر پێتان وا نەبوایە کە عوزەیر کوڕی خوایە. جوولەکەکانیش وتوویانە: ئێوەش کۆمەڵێکی باشن گەر لە قسەکانتاندا نەڵێن: "گەر خوا و محمد ویستیان لە سەری بێت". پاشان بە لای کۆمەڵە کەسێکی گاوردا تێپەڕی و لێی پرسین: ئێوە کێن؟ وتیان: ئێمە گاورین. ئەمیش پێی‌وتن: ئێوە کۆمەڵێکی باشن گەر نەتان‌وتایە: مەسیح کوڕی خوایە. ئەوانیش پێیان وت: ئێوەش کۆمەڵێکی باشن گەر لە گفت‌وگۆکانتاندا نەڵێن: "گەر خوا و محمد ویستیان لە سەری بێت". پاشان کە ڕۆژی لێ بووەوە ئەم خەونەی بۆ هەندێ کەس گێڕایەوە و، ئنجا ڕۆشتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و بۆ ئەویشی گێڕایەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەم خەونەت بۆ کەس گێڕاوەتەوە؟" وتی: بەڵێ. ئنجا کاتێ کە موسڵمانان نوێژیان لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ کرد، پێغەمبەر ﷺ وتاری بۆ دان و دوای حەمد و سەنای خوای گەورە فەرمووی: (توفەیل خەونێکی دیوە و بۆ هەندێ کەسی ئێوەشی گێڕاوەتەوە. ئێوە وشەیەکتان دەوت و لە قسەکانتاندا بەکارتان دەهێنا کە من لەبەر شەرم و حەیا نەهیم نەدەکردن لێی، بەڵام وا ئێستا پێتان دەڵێم: مەڵێن: گەر خوا و محمد ویستیان لەسەری بێت)[1].

لەم فەرموودە پیرۆزەوە تێ‌دەگەین لەوەی کە ویستی خوای گەورە بناغەی هەموو شتێکە و جگە لە خوای گەورە کەسی تر دەستی لەو ویستەدا نی‌یە. تەنانەت گەر بە "قەصد"ەوە وا بزانرێت کە جگە لە خوای گەورە کەسی تر دەستی تێدا هەیە، ئەوا بە کوفر و شیرك دادەنرێت.

ب - نموونەیەکی تر سەبارەت بەم بابەتە دەهێنینەوە:

حەزرەتی عبداللّٰهی کوری عەبباس - خوایان لێ ڕازی بێت - دەگێڕێتەوە کە پیاوێك عەرزی پێغەمبەری ﷺ کرد: گەر خوای گەورە و تۆ ویستتان لەسەری بێت. پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (منت کرد بە هاوتای خوا؟ بڵێ: گەر تەنها خوا بیەوێت)[2].

کەواتە پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە هەڵس‌وکەوت و کاروبارەکانی خواوەندەوە تەوحیدێکی ڕوون و ئاشکرای پێ‌یە بە چەشنێك کە بوار بە هەڵەی هیچ کەسێك نادات - با هەر نییەتێکیشی هەبێت - بەڵکو هەڵەکەی بۆ ڕاست دەکاتەوە و نایەڵێت کەسی تر هاوبەش بکات لە کاروباری خوای گەورەدا.

(١) موسنەدی ئیمامی ئەحمەد: ٥/٧٢.

(٢) موسنەدی ئیمامی ئەحمەد: ١/٢١٤

ج – حەزرەتی ئەنس دەفەرمویٚ: پیٚغەمبەر ﷺ زۆر جار دەیفەرموو: (یـا مُقَلِّـبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي على دِينِكَ). عەرزم کرد: ئەی پیٚغەمبەری خوا! ئیٚمە باوەڕمان بە تۆ و ئەو ئایینەش هیٚناوە کە تۆ بۆت‌هیٚناوین، ئایا هیچ مەترسی‌یەکت لیٚمان هەیە؟ فەرمووی: (بەڵیٚ، دڵەکان لە نیٚوان دوو پەنجەی خواوەندی میهرەباندایە چۆنی بویٚت ئاڵوگۆڕیان پیٚ دەکات)[1].

لە ڕیوایەتەکەی نەوواسی کوڕی سەمعاندا فەرموویەتی: (هیـچ دڵیٚك نی‌یە کە لە نیٚوان دوو پەنجەی خواوەندی میهرەباندا نەبیٚت، گەر بیەویٚت ڕاگیری دەکات و گەر بیشیەویٚت لە ڕیٚ دەیترازیٚنیٚت)[2].

لە ڕاستیدا خوای گەورە لەم ئایەتەی خوارەوەدا دوعایەکی وەك ئەمـەمان فیٚر دەکات:

﴿رَبَّنَا لا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعدَ إِذْ هَدَيْتَنا وَهَـبْ لَنَا مِـن لَدُنـكَ رَحْـمَةً إِنـكَ أَنـتَ الوَهَّابُ﴾(آل عمران:٨).

بیٚ گومـان هـەموو دوعـا و نزاکـان "ویستی خوایی" دەچەسپیٚنن. چونکە ئیٚمـە لـە پیٚشەکی‌دا باوەڕمـان هەیـە کـە خـوا دەتوانیٚـت دوعاکانمـان گـیرا بکـات، هـەروەك باوەڕیشمان هەیە بەوەی کە هەر خوای گەورە خۆی دوعاکردنمان ئیلهام دەکات، گەر ویستی لەسەری بیٚت.

بەم جۆرە، هەموو دوعایەك واتای دان‌نان دەگەیەنیٚت بـە "ویسـتی خـوای گـەورە"دا کە ئەویش یەکیٚکە لە بوعدەکانی قەدەر.

بۆیـە زۆر لەسـەر ئـەم مەسـەلەیە دوایـن، چونکـە پەیوەندی‌یـەکی بـەهیٚزی بـە "تەوحید"ەوە هەیە.

* * *

**سیٚهەم:** مەسەلەی "ئەمری جەبری" و "ئەمری شەرعی".

وا ئیٚستا لە مەسەلەیەکی تر دەدویٚین کە پـەیوەندیی بـە هـەمان بابەتـەوە هەیـە و، هەوڵ دەدەیـن پشـت بـەخوا ئـەم مەسـەلە سـەخت و ئـاڵۆزە وا ئاسـان بکـەین کـە دوور و نزیك لیٚی تیٚ‌بگەن.

ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە، دەکریٚت ببیٚـت بـە سـەرەتایەك بۆ ئـەم باسـەی کـە لیٚـی دەدویٚین:

---

(١) رواه مسلم: القدر ١٧.

(٢) رواه ابن ماجة: المقدمة ١٣.

﴿أَلا لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾(الاعراف:٥٤).

بەڵێ، هەروەك "ئەمر و خەلق" تایبەتە بە خوای گەورەوە، بە هەمان جۆر "حوكم و خەلق"یش هەر تایبەتن بە خۆیەوە.

ئەمر(فەرمان)ی خوای گەورەش دوو بەشە:

یەكەم: ئەمری تەكوینی، یاخود ئەمری جەبری، یاخود ئەمری تەقدیری.

دووهەم: ئەمری دینی، یاخود ئەمری شەرعی.

هەر تەنها ئەمری جەبری‌یە كە فەرمانڕەوا و زاڵە لەناو گەردووندا و، هەرشتێك كە خوای گەورە بە ئەمرە جەبری‌یەكەی بەدیی‌دەهێنێت كەس دەستی تێدا نی‌یە و ناتوانێت خۆی تێدا هەڵبقورتێنێت و، هەموان ناچارن گوێڕایەڵ و ملكەچی ئەم فەرمانەی خواوەند بن. چونكە هەر خواوەند خۆی خاوەن مولكە و چۆنی بوێت وەها لە مولكی خۆی‌دا ڕەفتار دەكات. جا ئەم هەڵس‌وكەوت و ڕەفتارەی خواوەند لە مولكەكەی‌دا ئێمە گوێڕایەڵ و ملكەچی خۆی دەكات و چ هێز و توانایەك لە ئاستی‌دا شك نابەین. هەرچی ئەمری دینی یاخود شەرعیشە: ئەویش بە هەمان جۆر ئاراستەی ئێمە كراوە، جێ‌بەجێ كردن یان جێ‌بەجێ نەكردنی ئەم ئەمر و فەرمانانە بەندە بە "ویست"ی مرۆڤەوە، كە لەم ڕووەوە صەلاحیەتێكی نیسبیی دراوەتێ، هەرچەندەش ئەو ویستە خۆی لە خۆی‌دا خاوەنی بوونێكی زاتی نی‌یە.

جا كاتێ بەم شێوەیە لەم دوو فەرمانە تێ‌دەگەین، ئەوا ئەو كاتە لە واتا و ناوەرۆكی هەموو ئەو ئەمر و فەرمانانە دەگەین كە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون و بە ڕواڵەت ئیختیلافیان تێدا دەردەكەوێت.

كەواتە سەبارەت بە ئەمری "جەبری" یان "كەونی"یەوە، ویست و ئیرادەی خواوەند بە چ شێوە و چۆنێتی‌یەك پەیوەندی بە ئایەتە تەكوینی‌یەكانەوە - واتە یاسا گەردوونی‌یەكانەوە - بكات، ئەوا شتان و ڕووداوەكان بەو پێ‌یە پەیدا دەبن و دێنە وجوود.. بەڵام سەبارەت بە فەرمانی شەرعی‌یەوە، ئەوا خوای گەورە فەرمانی بە كردەوەیەك داوە كە دەیەوێت بكرێت و لێی ڕازی‌یە. كەواتە هەردوو ئەمرەكە ویست و ڕەزامەندیی خواوەندیان تێدایە.

پەرستش و كرداری مەلائیكەتان و پێغەمبەران - علیهم السلام - هەروەها ئەو كردەوە چاكانەش كە بەندە باشەكانی خواوەند ئەنجامیان دەدەن.. هەموو ئەمانە، بە ویستی خواوەندن و خوای گەورە لێیان ڕازی‌یە.. بەڵام هەندێ شت هەن خوای گەورە لێیان ڕازی نی‌یە، هەرچەندەش لە بناغەدا ویستی خوایان لەسەرە، وەك: كوفر و

گوناهەکان و هەموو جۆرێکی کردەوە خراپەکان. ئەم ئایەتە پیرۆزانەی خوارەوە ئاماژە بۆ ئەم جۆرە شتانە دەکەن:

﴿ولا يَرضَى لِعِبَادِهِ الكُفرَ﴾(الزمر:٧).

﴿إِنَّ اللهَ لا يحبُّ المُفسِدينَ﴾(القصص:٧٧).

﴿إِنَّهُ لا يُحِبُّ المُسرِفِينَ﴾(الأنعام:١٤١).

﴿إِنَّه لا يحبُّ المعتَدين﴾(الأعراف:٥٥).

﴿إِنَّ اللهَ لا يُحبُّ مَن كانَ مُختَالاً فَخُوراً﴾(النساء:٣٦).

بەڵێ، هەر تەنها خوای گەورەیە کە "خراپە" بەدیدەهێنێت، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە "ویست"ی خۆی پەیوەندیی پێوە کردووە، بەڵام لە "خراپە" ڕازی نییە. هەموو جۆرە کردەوەیەکی خراپ بە هەمان جۆرە. جا ئەگەر لەم گۆشەیەوە بڕوانینە مەسەلەکە، ئەوا بە شێوەیەکی ڕوونتر لە هەندێ ئایەتی پیرۆزی قورئان تێدەگەین. دەسا با لەم گۆشەیەوە سەیرێکی ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە بکەین:

﴿وإِذا أَرَدْنَا أَنْ نُهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيها فَفَسَقُوا فيها فَحَقَّ عَلَيْها الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيراً﴾(الإسراء:١٦).

واتە گەر بمانەوێت شارێك یان شارستانێتییەك لەناوبەرین، ئەوا کەسانی هەرزە و نزمی خۆیان تەنانەت هەرە ستەمکارەکانیان بەسەردا زاڵ دەکەین، تاکو سزای سەختیان بدەن، دوای ئەوەی کە ڕۆزییەکەیان تەنانەت پاروەکەی دەمیشیان لێ زەوت دەکەن. بەڵام خۆ خەڵکی ئەو شوێنە هەر خۆیان ئەو ستەمکارانەیان کرد بە سەرگەورەی خۆیان بەوەی کە بە هەموو جۆرێکی سووکایەتی و ڕسوایی ڕازی دەبوون کە ستەمکارەکان دەیانهێنایانە ڕێیان، تا لە ئەنجامدا پێی ڕاهاتن.

بە ڕواڵەت وا دەردەکەوێت کە ئەو خەڵکە بە ویستی خۆیان ستەمکارەکانیان هەڵبژاردووە و کردوویانن بە سەرۆکی خۆیان، بەڵام ئایا لە حەقیقەتدا وایە؟

"موترەف"ەکان ئەوانەن کە لە گیان و ناوەڕۆکدا نزم و بێنرخن، بەڵام جڵەوی کاروباری خەڵکیان گرتووەتە دەست و لەم ڕێیەوە "سووکی و نزمایەتی" بووە بە چارەنووسی نەتەوەکەیان و ئەوانیش دووچاری هەرزەیی بوون، چونکە جڵەوی فەرمانڕەوایی و کاروباری نەتەوەیان خستووەتە ئەستۆ. جا کاری ئەو موترەفانە بریتییە لەوەی خەڵکی بخلافێنن و لە ڕێ دەریان بکەن. خۆ هەرکات کار گەیشتە ئەم ڕادەیە ئەوا کاتی ڕووخان و تیاچوونی ئەو نەتەوەیە یان ئەو شارستانێتییە هاتووەتە پێشەوە.

ئەم فەرمانەی کە لەم ئایەتەدا باسی هاتووە وا دیارە فەرمانێکی "تەکوینی" بێت نەك "شەرعی"، چونکە هەرگیزاوهەرگیز خواوەند بە فەرمانێکی شەرعی فەرمان بە موترەفەکان نادات کە: چ کردەوەیەکی خراپ دەکەن بیکەن. ئایەتی پیرۆزی: ﴿إنَّ اللهَ لا يَأمُر بالفَحْشَاءِ﴾(الأعراف:٢٨) بەڵگەیە لەسەر ئەمە.

تەوفیقی نێوان ئەم دوو "ئەمر"ەی کە لە هەردوو ئایەتەکەدا هاتووە لەوەدایە کە ئەمری ئایەتی یەکەم ئەمرێکی تەکوینییە، بەڵام هی دووهەم ئەمرێکی شەرعییە. بە وێنەی ئەو ئەمرەی کە لەم ئایەتە پیرۆزەدایە:

﴿إنَّ اللهَ لا يُغيّرُ ما بقَومٍ حتى يُغيِّروُا مَا بأنفُسِهِم﴾(الرعد:١١)..

جا ئەگەر جیهانی ناوخۆی مرۆڤ فەسادی تێدا بڵاو بووەوە و، ئەستێرەکانی ئاسمانی "ڕۆح"یشی داکەوتن و، بەختەوەریی کۆمەڵایەتی و شارستانێتیی مرۆڤ بە پێچەوانەوە وەرچەرخا، ئەوا هەموو ئەو ڕووناکییانە دەکوژێنەوە کە زووتر لە پێش چاواندا دەدرەوشانەوە.

بۆیە دەبێ زۆر بە باشی لە هەردوو ئەمرەکە تێبگەین.

"جەبرییەکان" لەبەر ئەوەی ئەم دوو ئەمرە شەرعی و تەکوینییەیان لە یەك جیا نەکردەوە، لە ڕێ ترازان و بەهەڵەدا چوون. ئەوەبوو ئەم دوانەیان تێکەڵ کرد و ئینکاریی "ویستی مرۆڤ"یان کرد.. "موعتەزیلەکان"یش ویستی مرۆڤیان کرد بە بناغەی ڕێڕەوەکەیان و وتیان: مرۆڤ خۆی بەدیهێنەری کردەوەکانیەتی، بەم جۆرە پێیان لە ڕێی ڕاست ترازا.

بەڵام ئێمە لەسەر ڕاستەشەقامێکی ڕێكدا لایەنە جوانەکانی هەردوو لامان لە لا کۆبوونەتەوە و، دەڵێین: "ویستی خوای گەورە" بناغەیە لە هەردوو فەرمانە شەرعی و تەکوینییەکەدا. بەڵام لە فەرمانە شەرعییەکەدا پلەیەك دراوە بە "ویستی بەندەکان" کە بریتییە لەوەی: بە مەرجێکی عادی دانراوە. خۆ ئەگەر هەر شتێك "ویستی خوای گەورە"وا پەیوەندیی پێوە بکات کە نەیەتە وجوود، ئەوا هەرگیز نایەتە وجوود. بەڵام ئەو شتانەی کە خاوەنی وجوودی خارجین بەم جۆرە نین، چونکە لەو شتانەدا ویستی خوای گەورە تەنانەت پەیوەندی بە شتانی خراپ و ناشیرینیشەوە دەبەستێت، ئەوەندە هەیە خوای گەورە بەو شتانە ڕازی نییە، بۆیە بەندەکان لەسەر کردەوە خراپەکانیان سزا دەدرێن.

بە هەمان جۆر "هیدایەت" و "گومڕایی"ش بەندن بە ویستی خوای گەورەوە. قورئانی پیرۆز لە زۆر ئایەتیدا ئەمەی ڕوون کردووەتەوە، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە:

﴿فَمَن يُرِدِ اللهُ أَنْ يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلإِسلامِ وَمَنْ يُرِدْ أَنْ يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقاً حَرَجاً كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّماءِ كَذَلكَ يَجعَلُ اللهُ الرِّجْسَ عَلى الَّذِينَ لا يُؤمِنُونَ﴾(الأنعام:١٢٥).

سروەی "ئیمان" بە نەرم و نیانی و سازگاری هەڵدەکات و بەر پەڕەی دڵی مرۆڤ دەکەوێت. ئەم دڵەش شیرینیی بەختەوەری دەچێژێت و ئیمانەکەشی خۆشحاڵیی یەك لە دوای یەکی پێ دەبەخشێت. خۆ هەتا "ئیمان" زیاد بکات شادمانی و خۆشحاڵییەکەشی پتر پەرە دەسێنێت، تاکو بەم ئیمانە دەگاتە چلەپۆپەی کەماڵی مرۆڤایەتی و سەرتاپا دەبێت بە نموونەیەك بۆ چاکە و مەردایەتی. بێ گومان مرۆڤ بۆ خۆی نەگەیشتە ئەم پایە بڵندە، بەڵکو ئەو خوایە گەیاندی کە بەسەر هەموو شتێكدا بەتوانا و دەستەڵاتە. چونکە هەر ئەو خواوەندەیە کە مرۆڤی بەسەر پلیکانەی هیدایەتدا پلەپلە سەرخست تاکو گەیاندیە ترۆپك و دوا پلەکان.. کەچی زۆر کەس هەن "ژیری" و "زیرەکی"یان دراوەتێ، بەڵام بەهرەمەندی "هیدایەت" نەبوون و بە وێنەی ئاژەڵ دەژین. بەو واتایەی کە هۆکاری "هیدایەت" و "گومڕایی" پەیوەندیی بە توانا و قابیلییەت یاخود ویستی مرۆڤەوە نییە، بەڵکو هیدایەت ئاسەوارێکی پڕ لە حیکمەتی ویستی خواوەندە.

بەم ڕوونکردنەوەیە دەردەکەوێت کە ئێمە بواری دەستتێوەردانی شتان و ڕووداوەکانمان نییە. لەبەر ئەوە، دەتوانین بڵێین: ئێمە جگە لە تەنها هۆکارێك هیچ ڕۆڵێکمان لە "بەدیهێنان"دا نییە. بەڵێ ڕاستە، هیچ شتێك بە بێ ویستی خواوەند نایەتە وجوود، چونکە جگە لەو کەسی تر خاوەنی ئەو توانستە نییە کە شتانی نامومکین و نەگونجاو بکات بە مومکین و گونجاو، هەروەها بە پێچەوانەشەوە. هەر تەنها خواوەندە کە هێز و تواناکەی خۆیی(ذاتی)یە. هەر لەبەر ئەمەشە کە خوای گەورە: "ذو القوة المتين" و "القوي العزيز"ە. ئەو خواوەندەش هەروەك هێزی ئەنجامدانی کاری پێداوین، بەکارهێنانی ویستەکەشمانی بەرەو ئەو ڕووکارە دیاریکراوە پێبەخشیوین. بەڵام هەرچەندە خواوەند ویستی بە ئێمە داوە، هەر هێشتا ویست و مەشیئەت هی خۆیەتی و تایبەتە بە خۆیەوە. لە مەسەلەی هیدایەت و گومڕاییشدا بە هەمان جۆرە و هیدایەتبەخش و ڕێ لێونکەر هەر خوای گەورەیە.

هەر ئەو خواوەندەیە کە هاندەری کوشتنی پێغەمبەری ﷺ خستە دڵی عومەرەوە و بە نیازی کوشتنییەوە بەرەو لای پێغەمبەر ﷺ کەوتەڕێ، کە ڕۆشتنێك بوو بە ڕواڵەت وەك گومڕایی وایە، کەچی خستیە ناو باوەشی گەرموگوڕ و نەرمونیانی هیدایەتەوە! هەر ئەو

خواوەندەشە کە بەهۆی "عارەق"ەوە "ئەعشا"ی[١] لەسەر گومڕایی هێشتەوە. نموونەی ئەمانە هێندە زۆرن کە نەك بە سەدان بەڵکو بە هەزاران دەبن.

جا ئایا دوای ئەمە چی لە بەردەم مرۆڤدا دەمێنێتەوە، جگە لەوەی دان بەوەدا بنێت کە "هیدایەت" و "گومڕایی" بە دەستی خواوەندن؟

بەڵێ، هەردووکیان بە دەستی ئەون.

هاودەم لەگەڵ دانان بە هەموو ئەمانەدا کە باس کران، خوای گەورە "ویست"ێکی ماهییەت نەزانراوی لە ماهییەتی ئێمەدا داناوە، چونکە خوای گەورە کاری نابەجێ و بێهوودەی لێ ناوەشێتەوە. ئنجا خواوەند هەموو ئەو کردارانەی کە ئێمە چ لە ڕابوردوو چ لە ئایندەدا کردوومانن و دەیانکەین، لەسەر ئەو ویستە ماهییەت نەزانراوەی ئێمە بنیاتی ناون، جگە لەوەی کە پێشتر نەخشە و پلانی ئەم بینایەی لە "لەوحی مەحفووظ"دا کێشاوە، بەر لەوەی مرۆڤ بەدیبهێنێت.

کەواتە ئێمە تەنها ئەوەندەمان لە بەردەمدایە کە داوای "هیدایەت" لە خوای گەورە بکەین، چونکە وەك نەختێ پێش ئێستا لە باسی ئایەتەکەدا وتمان: خوای گەورە گەر بیەوێت کەسێك "هیدایەت" بدات: سنگی بۆ ئیمان دەکاتەوە و حەز و ڕەغبەتی ئەخاتە سەر ئیسلام و ڕووی جوان و درەخشانی حەقیقەتی بۆ دەردەخات، ئیتر مرۆڤیش لە لایەنی خۆیەوە هەست بە شەوق و هاندەرێك دەکات بۆ خواستنی حەقیقەت و عەودالْبوونی بە دوایدا. هەر کەسێکیش خوای گەورە بیەوێت گومڕای بکات: سنگی تەنگ دەکات و ئەویش بە هیچ فەرمانێکی ئیسلام ڕازی نابێت و پشت لە یادخستنەوە و ئامۆژگاری هەڵدەکات، تا وای لێ دێت کە هەر هەنگاوێك دەنێت، لە ئیسلام دووری دەخاتەوە: ﴿كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ۞ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ﴾(المدثر: ٥٠-٥١)!

هەموو ئەمانەی کە باسمان کردن تەنها مەرجێکی عادین، ئەویش بریتییە لە: "ویستی مرۆڤ".. لە: "هەست کردن بە ئەنجامدانی کارێك یان ئەنجام نەدانی". لە ڕاستیشدا ئەوەی کە ئەم مەسەلەیە ڕوون دەکاتەوە بریتییە لەوەی کە: مرۆڤ خۆی بە سەربەست دەزانێت و بەرامبەر بە کردەوەکانی لە ناخەوە هەست بە بەرپرسیاریی خۆی دەکات. کەواتە ئەو ویستەی بە مرۆڤ دراوە ڕۆڵی بەردی بناغەی کردەوەکانی مرۆڤ دەبینێت و خوای گەورەش لەسەر ئەم بناغەیە ئەو شتانە بەدیدەهێنێت کە ویستی لەسەریانە.

---

(١) ئەعشا: شاعیرێکی جاهیلییە و ناوی "مەیموونی کوڕی قەیس"ە و لە ساڵی (٨ك - ٦٢٩ز) لە دنیا دەرچووە. یەکێکە لە شاعیرانی خەمر و غەزەلی بێپەردە و مەدحی کەسایەت پێوە کردن. (وەرگێڕ)

وا دابنێ کە ئێوە دەتانەوێت بارودۆخی ئەم دنیایە ڕاست بکەنەوە و بۆ ئەم مەبەستە ئەو "ویست"ەی خۆتان کە لە ناخی خۆتاندا هەستی پێ دەکەن - تا قۆناغێکی دیاری کراو - خستە کار و، کۆشش و سامانیشتان لەو پێناوەدا خەرج کرد تا هەرچی وزە و توانا و سامانتان هەیە، لەو ڕێیەدا خستانە کار و هەموو ئەو ڕێگایانەشتان گرتەبەر کە دەتانگەیەنە ئامانجەکەتان و ئیتر هیچ شتێکتان لە توانادا نەما. واتە هەموو ئەو شتانەتان لەو پێناوەدا خستەکار کە لە ویستی مرۆڤەوە چاوەڕوان دەکرێن، ئا ئەو کاتە "ویستی خوای گەورە"ش بە نەصرەت و یارمەتیدانی خۆی بە هاناتانەوە دێت و هەموو ئەو هۆکارانەتان پێ دەبەخشێت کە دەتانەوێت و پێویستتانە.

بەڵێ، خوای گەورە گەلێ نیعمەت و چاکەی خۆی بە ویستە نەزانراوەکەتان دەبەخشێت. ئەمەش یاسایەکی خواییە و هەرگیزاوهەرگیز ئاڵوگۆڕی بەسەردا نایەت.

جا دەبێ - بەپێی ئەم تێگەیشتنە - بزانن کە چ کارێکتان دەکەوێتە ئەستۆ و چاوەڕوانی چی لە خوای گەورە دەکەن.

خۆ ئەگەر خوای گەورە هەندێ نیعمەت و بەخشایشی خۆی پێ بەخشین، بێ ئەوەی خۆتان شایانی ئەو بەخششانە بن، ئەوا تەنها لوتف و کەرەمێکی خواوەندە و خوای گەورە پرسیاری لێ ناکرێت چ کارێك دەکات و بۆچی دەیکات.. بەڵام دەبێ بزانرێت کە نابێ کردەوەکانی مرۆڤ لەسەر ئەم لوتف و کەرەمانە بنیات بنرێن.

بەڵێ، دەبێ ئێوە هەموو ئەو کار و پێداویستییانە ئەنجام بدەن کە لە بازنەی "هۆکارەکان"دان و لە ئەستۆی خۆتان و ویستەکەتان نراوە، ئنجا دەستەکانتان بەرز دەکەنەوە و داواکارییەکانتان لە بەردەم خوای گەورەدا دەخەنە ڕوو.

خۆ ئەگەر مەسەلەکە لە سەرەتاوە وەربگرین، ئەوا دەڵێین: خوای گەورە "بەدبەختیی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی" لەسەر دەستی ئێوەدا لا دەبات و گۆی زەوی لە دادگەری پڕ دەکات و هەموو کاروبارەکانیش لەسەر صەلاحەت و چاکسازی دادەمەزرێن و جێی خۆیان دەگرن، دوای ئەوەی کە ئێوە هەموو کارەکانی ئەستۆتان بە ئەنجام گەیاند.

ئایا ئەمە وانییە؟

بەڵێ، خوای گەورە نیعمەتی "شەهادەت" بە کەسێك دەبەخشێت کە گیانی خۆی لە پێناوی خوادا بەخت دەکات.. پاشان سەرجەمی نیعمەتەکان، یەك لە دوای یەك، هەر لە نیعمەتی بەهەشتەوە تا دەگاتە نیعمەتی بینینی جوانیی خوای گەورە و نیعمەتە لە ژمارە نەهاتووەکانی تر، بە دوای یەکتردا دێن و بەسەریدا دەڕژێن. وەك بڵێی خوای

گەورە - بە فەزڵ و بەخشندەیی خۆی - عەقدو پەیمانێکی لە نێوان خۆی و مرۆڤدا گرێ دابێت.

لەبەر ئەمە، هەتا هەموو کارەکانی ئەستۆتان جێبەجێ نەکەن، هەرگیز چاوەڕوان مەبن کە حەزرەتی مەسیح - دروودی لەسەر بێت - دابەزێتە خوارەوە و حەزرەتی مەهدییش - خوای لێ ڕازی بێت - سەرهەڵبدات! چونکە خوای گەورە یاسا و عادەتەکانی خۆی کە تەنانەت بۆ پێغەمبەرە بەڕێزەکانیشی - علیهم السلام - نەگۆڕیوە، بۆ ئێوەی ناگۆڕێت.

بەڵێ، هەر لە دێر زەمانەوە شارێگا و ڕاستە شەقام هەر ئەمە بووە. ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ چەندەها جاری زۆر گرفتاری برسێتی و تینوێتی دەبوو، هەروەك لە جەنگدا دانەکانی پێشەوەی شکان و سەر کولم و پێ‌کانی بریندار بوون و گەلێ ئەشکەنجە و سەختی و گیروگرفتی هاتە ڕێ. هاوەڵە بەڕێزەکانی دەوروبەریشی بە هەمان جۆر بوون؛ هێندە گیروگرفت و تەنگانەیان تووش بوو هەتا هەر هەموویان هاواریان لێ هەڵسا و وتیان: ﴿مَتَى نَصْرُ اللهِ﴾؟ یارمەتیدانی خوای گەورە کەی دێت بە دەمانەوە؟ تا لەم کاتەدا یارمەتی‌دانی خواوەندی فریادڕەس هات بە هانایانەوە و پێ‌یان وترا: ﴿إِنَّ نَصْرَ اللهِ قَرِيبٌ﴾. ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە ئەم حەقیقەتەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە:

﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَنْ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُمْ مَثَلُ الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلِكُمْ مَسَّتْهُمُ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ وَزُلْزِلُوا حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللهِ أَلَا إِنَّ نَصْرَ اللهِ قَرِيبٌ﴾(البقرة: ٢١٤).

واتە دوای ئەوەی کە هیچ شتێك بە دەستەوە نەما: نە پارووێك کە مرۆڤ لە برسێتی ڕزگار بکات و.. نە قومێك ئاو کە تینوێتیی بشکێنێت و.. نە پارچە حەسیرێك لەسەری ڕابکشێن.. تا لەم کاتەدا و بە زمانی حاڵی ڕووداوەکان لە لایەن جیهانی غەیبەوە دەوترێت: ﴿إِنَّ نَصْرَ اللهِ قَرِيبٌ﴾. جا ئێوە دەبێ "ویست"ی خۆتان بخەنە کار و هەر بەردەوامیش بن تا ئەم دەنگە دەبیستن. واتە دەبێ بە وێنەی مۆم بەردەوام دابگیرسێت و کار بکات - کە ئەمەش ئەرکی ئەستۆیەتی - جا کاتێ گەیشتە دواهەمین تروسکایی، ئەو کاتە یارمەتیدانی خوای گەورە بە هانایەوە دێت. ئێوەش بە هەمان جۆرن، دەبێ تا ئەوپەڕی ویستی جوزئیتان و تا دواهەمین خاڵی ئەو ویستە، لێ ببڕێن و تێ‌بکۆشن. ئیتر ئەو کاتە ویستی کوللیی خوای گەورەش دەکەوێتە کار و، زەلیلیتان دەکات بە: "سەربەرزی" و دواکەوتنتان دەگۆڕێت بە "پێشکەوتن"ێکی درەخشان.

جا ئایا پێتان وایە كە ئێستا ئێوە بە ڕاستی و بە هەموو هێز و توانایەكتانەوە "ویست"ی خۆتان خستووەتە كار؟ خۆ ئەگەر وەڵامتان "بەڵێ"یە، ئەوا مژدەتان دەدەمێ و پێتان دەڵێم: (دڵنیا بن ئەو خوایەی كە جڵەوی ئاسمانەكانی لە دەستدایە و توانای بەسەر هەموو شتێكدا هەیە، بە ویستی ڕەهای خۆی دێت بە فریاتانەوە و سەرتان دەخات و فڕوفێڵی چەپەڵی خراپكاران بەسەر خۆیاندا دەشكێنێتەوە و ئێوەش لە هەموو خراپەیەك دەپارێزێت.. عادەتی خوا ئاوایە. جا ئێوەش لەم مژدەیە دڵنیا بن، مادەم هەرچی پێویستی و ئەركی سەرشانتان هەیە جێبەجێتان كردوون).

بەم ڕستانەی خوارەوە هەموو ئەو شی كردنەوانە كورت دەكەینەوە كە لە بارەی "قەدەر" و "ویستی خواوەند"ەوە بە درێژی خستمانە ڕوو:

خوای گەورە بە "زانینی گشتگیر"ی خۆی دەزانێت ئێمە لە ئایندەدا چ كردارێك دەكەین. ئنجا لە شێوەی نەخشە و پلانێك و لە لەوحی مەحفووظدا ئەم "زانین"ەی خۆی تەقدیر و دەستنیشان و تۆمار دەكات.. پاشان مەلائیكەتە بەڕێزەكان لە چەند كتێبێكدا كردەوەكانی ئێمە تۆمار دەكەن كاتێ كە دەیانكەین. جا ئەم دوو كتێبە بە تەواوەتی وەكو یەك دەردەچن و هیچ جیاوازییەكیان لە نێواندا نابێت. بێ گومان لە هەموو ئەمانەدا ویستی خواوەند دەستبەكار و جێبەجێ كراو بووە، چونكە ئێمەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت باوەڕمان وایە كە: هەر شتێك ویستی خوای گەورەی لەسەر بێت، دەبێت.. هەر شتێكیش ویستی ئەو لەسەر "نەبوون"ی بێت ئەو شتە نابێت و نایەتە وجود.

### ٤ – قەزا و قەدەر لە ڕووی بەدیهێنانەوە.

خوای گەورە بەدیهێنەری هەموو شتێكە. كەواتە "هەموو شت"ێك بەدیهێنراوی ئەوە، ئێمە خۆمان و كردەوەكانیشمان بەشێكین لەو "هەموو شت"ەی كە بەدیهێنراوی ئەون. بۆیە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿خَلَقَكُمْ وَما تَعْمَلُون﴾(الصافات:٩٦).

لە فەرموودەی پیرۆزیشدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:

"إنَّ اللهَ تعالى صانِعُ كُلِّ صانِعٍ وصنعَتَهُ"[١].

هەر كارێك دەكەن.. هەر شتێك ئەنجام دەدەن: بەرد دەتاشن یاخود مەڕمەڕ، بەدیهێنەری خۆتان و بەدیهێنەری كارەكەتان هەر تەنها خوای گەورەیە. ئەو كەسەی

(١) كنـز العمال: ٢٦٣/١، البخاري: خلق أفعال العباد، الحاكم والبيهقي في الأسماء عن حذيفة.

توانای بیرکردنەوەی پێ بەخشیون و وای لێ کردوون کە بیر بکەنەوە و پاشان ئەو شتانەش دەربڕن کە بیری لێ دەکەنەوە، هەر تەنها خوای گەورەیە. کەواتە ئیتر کامەیە بەشی "ویست"ی ئێمە؟ ئەرکی سەرشانی "ویست"مان لەم چەشنە مەسەلانەدا چی‌یە؟

ئەو شتەی کە ئێمە ناوی "ویستی مرۆڤ"مان لێ ناوە هێندە بچووکە کە هەرچەندەش ئاسۆی ڕوانینمان قووڵ و فراوانتر بکەین هێشتا هەر ناتوانین ببینین، چونکە خاوەنی بوونی دەرەکی نی‌یە. ئنجا هێندەش بچووکە کە ناتوانرێت بەپێی قاعیدەی "تەناسوبی عیللییەت" هیچ پەیوەندی‌یەك لە نێوان خۆی و ئەو کردەوانەدا دروست بکرێت کە لە ئەنجامی بەکارهێنانیەوە پەیدا دەبن. بەڵێ، ویستی ئێمە هەرچەندەش بچووك بێت، کەچی لوتف و چاکەی خواوەند بەسەرمانەوە یەکجار گەورە و مەزنن.

"بەدیهێنەر هەر خوایە". چونکە قورئانی پیرۆز و سوننەتی خاوێنی پێغەمبەر ﷺ و نەتەوەکەشی لە پشت سەریەوە - کە ئێمەش بەشێکین لە نەتەوەکەی - دەست بە دوعا لێی دەلاڵێنەوە کە ئەو شتەی بۆی تەقدیر کردووین خێر بێت، لەمەش‌دا پشت بە میهرەبانیی خواوەند دەبەستین نەك بە ویستی خۆمان. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە یەك دوو دوعا دەهێنین:

"اللّهم إني أستخيرُكَ بِعلمكَ وأستَقدرُكَ بقُدرَتِكَ وأسألكَ مِن فَضلكَ العظيم، فإنَّكَ تقدِرُ ولا أقدر وتَعلم ولا أعلَم وأنتَ علاّمُ الغُيُوب. اللّهُم إن كنتَ تَعلَمُ أن هذا الأمرَ خيرٌ لي في ديني ومَعاشِي وعَاقبَةِ أمري أو قَالَ عَاجِلِ أمري وآجله، فاقدره لي ويسّره لي ثم بارك لي فيه، وإن كنتَ تعلم أن هذا الأمر شرٌّ لي في ديني ومَعاشي وعَاقبة أمري أو عاجل أمري وآجله فاصرفهُ عَني واصرفنِي عَنهُ واقدر لي الخيرَ حيثُ كانَ ثُم رَضِّني بِهِ"[1].

پێغەمبەر ﷺ لەم دوعایەی‌دا هەندێك لە نهێنی‌یەکانی "قەدەر"مان فێر دەکات و تێماندەگەیەنێت کە جگە لە خوای گەورەی بەتوانا کەسی تر نامانگەیەنێت بە "خێر" و کەسی تریش جگە لەو "شەڕ" و بەڵامان لێ دوور ناخاتەوە. چونکە هەر تەنها ئەوە کە بەوەی تامی ئازاری "خراپکاری‌یەکان" دەرخواردی ویجدانمان دەدات، لە کردەوەی شەڕ و خراپکاری دوورمان دەخاتەوە، کەچی لە بواری خێر و چاکەکاری‌دا سروەی میهرەبانی‌یەکەی بەسەر ویجدانماندا هەڵدەکات و لەم ڕێیەوە ویجدانیشمان

---

(١) البخاري: التهجد ٢٥، ابن ماجه: الإقامة ١٨٨.

دەگەشێتەوە و هێندە خۆشحاڵ دەبێت کە بە هەموو هێز و توانایەکمانەوە هەوڵ بۆ کردەوەی چاك دەدەین تاکو ئەو خێرە دەخەینە باوەشمان. لە ڕاستیدا هەر تەنها خواوەندە کە "بیده الخیر"ە، واتە خێری بە دەستە. چونکە هیچ کەسێکی تر جگە لەو ناتوانێت خێرمان بهێنێتەڕێ یان دووری بخاتەوە لێمان. جگە لەمە هیچ گریمانێکی تر لە گۆڕێدا نییە.

هەر تەنها خوای گەورەیە ئەو بەلایەی لە کۆڵ حەزرەتی یووسف کردەوە - دروودی لەسەر بێت - کە هاتە ڕێی. ئێمە لێرەدا لەو "بورهان"ە نادوێین کە حەزرەتی یووسف چاوی پێی کەوت، بەلام دەڵێین: خوای گەورە پێغەمبەرێکی گەورە و بێ گەردی لە شەڕی ئافرەتێك ڕزگار کرد. بۆیە لە قورئاندا بەم جۆرە باس کراوە:

﴿كَذَلك لِنَصْرِفَ عَنهُ السُّوءَ والفَحشَاءَ إِنَّهُ مِن عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ﴾(یوسف:٢٤).

ئالێرەدا لوتف و چاکەی پەروەردگار دێت و دەکەوێتە نێوان "کردەوەی خراپ" و "مەیلی ویستی مرۆڤ"ەوە و، بەم جۆرە ئەو کەسە لەو مەیلەی کە هەیەتی بەرەو خراپکاری ڕزگار دەکات. بەلام ئالێرەدا شتێك هەیە ئەویش بریتییە لە ئیخلاسی حەزرەتی یووسف - دروودی لەسەر بێت - چونکە هەر ئەو ئیخلاسە بوو کە لوتف و چاکەی خواوەندی بۆ خستە کار، ئەوەتا خوای گەورە خۆی دەفەرموێ:

﴿إنه مِن عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ﴾.

ئەم واتایە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ ڕوونی دەکاتەوە کە گەلێ واتای گەورە و قووڵی تێدایە، دەفەرموێ:

(ألا وإن في الجسد مُضغةً إذا صَلحت صَلح الجسد كله وإذا فسدت فسد الجسد كله ألا وهي القلب)[1]!

بەڵێ گەیشتنی دڵی مرۆڤ بە ئیخلاس و قوڵپدانی بە خۆشەویستی و شکۆمەندیی خوای گەورە، هۆکارێکە بۆ دوورخستنەوەی ئەو بەلا و گێروگرفتانەی کە یەك لە دوای یەك بەسەر مرۆڤدا دادەبارێن.

لەو فەرموودەیەشدا کە ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە، پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لە دوعایەکیدا باسی ئەوە دەکات کە خوای گەورە بەدیهێنەری کردەوەکانە، هەروەك بەدیهێنەری هەموو شتێکی تریشە. ئەمەش لە دوعای: "إستفتاح"دا کە هەندێ لە ئیمامەکان دەیخوێنن و ئەمەی خوارەوە بەشێکیەتی:

---

(١) رواه البخاري: الإيمان ٣٩.

(اللَّهُم لامَانِعَ لما أعطَيتَ وَلا مُعطِيَ لِمَا مَنَعتَ وَلا يَنفَعُ ذَا الجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ)[1].

لەم دوعایـەوە تێدەگـەین کـە هیـچ شتێك قـەزا و حوکمـی خـوای گـەورە ناگێڕێتـە دواوە. کەواتە ئێمە تەنها "مەیل و ڕووتێکردن"مان لە بەردەمدا ماوەتەوە!

لـە ڕاستیدا ئێمـە هەسـت بـە دڵنیـایی و متمانەیـەکی گـەلـێ گـەورە دەکـەین کاتـێ دەزانین کە: خوای گەورە بەدیهێنـەری کردەوەکانیشـمانە. چونکـە ئەمـە مزگێنییـەکی گـەورەی خۆش و بەهێزمان دەداتـێ و دڵنیامـان دەکـات کـە خـوای گـەورە دەسـت لـە ئێمە و کردەوەکانمان هەڵناگرێت و، هەموو کات و ساتێك تەنانەت لە خۆشمان نزیکترە لێمانەوە! باشە ئایـا دەبێ چ شتێك هـەبێت کـە لەمـە زیـاتر مرۆڤ دڵخۆش و شـادمان بکات؟! چونکە ئێمە بەم هەست و نەستانەوە خۆمان دەهاوینـە نـاو باوەشـی میهرەبانیی خواوەنـد و هـەموو کردەوەکانمـانی پێ دەسپێرین. جـا ئـەم ملکـەچی و تەسـلیمبوونە موتڵەقەمان بۆ خوای گـەورە هۆکارێکـە بـۆ ئـەوەی کـە ویسـتی خواوەندمـان بـە وێنـەی شەپۆلی بە تەوژم و تین بۆ بخاتـە کـار و بمانهاوێتـە نـاو دەریـای ناسـینی خـوای گـەورەوە! ئێمە بەم ئاوات و ئارەزووانەوە چاوەڕوانی ویستی خواوەندین.. جـا ئومێدەوارین کـە خوای گەورەی بەتوانا لەم چاوەڕوانییەماندا نائومێد و دڵشکاومان نەکات.

لـە سـەرەتای ئـەم باسـەدا وتمـان کـە: "هیدایـەت" و "گومڕایـی" لـە لایـەن خـوای گـەورەوەن و پەیوەسـتن بـە ویسـت و بەدیـهێنانی خواوەنـدەوە. قورئـانی پـیرۆز بـە تێروتەسەلی ئەم مەسەلەیە ڕوون دەکاتەوە. بەڵام لێرەدا تەنـها یـەك دوو ئایـەت بـە نموونـە دەهێنینەوە:

﴿مَن يَهْدِ اللهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ وَمَن يُضْلِل فَلَن تَجِدَ لَه وَلِيّاً مُرشِداً﴾(الكهف:١٧).

﴿وَمَن يَهْدِ اللهُ فَهُوَ المهتَدِ﴾(الإسراء:٩٧).

﴿وَمَن يَهْدِ اللهُ فمَا لهُ مِن مُضِلٍّ أليسَ اللهُ بعَزيزٍ ذِي انتِقَام﴾(الزمر:٣٧).

ئـەو کەسـەی کـە خـوای گـەورە هیدایـەتی بـدات، تیشـکەکانی "هیدایـەت" دەڕژێنە ناو دڵیەوە تا تیـایدا جێگیر دەبن.. خۆ ئـەو کەسـەش کـە خـوای گـەورە بیەوێت لە ڕێ بیترازێنێت، ئەوا هیچ کەسێك نـاتوانێت لـەو گومڕاییـە ڕزگـاری بکات، تەنانەت ئەگەر سەرجەمی وتـارخوێن و واعیزەکـانیش پێکـەوە کۆببنـەوە و هـەموو ئـەو شـتانەی بۆ ڕوون بکەنـەوە کـە پێویسـت بێـت بـۆ ڕزگـارکردنی لـە گومڕایی، ئەوا هەر بێ ئاکام دەبێـت، هەرچـەندەش ئـەوان پاداشـتی ئامۆژگـاری و

---

(١) رواه البخاري: القدر ١٢.

ڕێنماییەکانیان وەردەگرن. چونکە ئەو کەسە قابیلییەتی هیدایەتی لێ داماڵراوە، بۆیە هیچ کارێك لەگەڵیدا سوودی نابێت.

پێم وایە دیمەنی گشتیی ئێستای ئێمە نموونەیەکی سەروزیادی ئەمەیە.

لێرەدا شتێك هەیە دەبێ لە پێش چاومانی دوور نەخەینەوە، کە بریتییە لەوەی: خوای گەورەی بەدیهێنەری هیدایەت و گومرایی، بەپێی "ویستی مرۆڤ" هیدایەت و گومرایی بەدیدەهێنێت، هەرچەندەش ئەو ویستە شتێکی گوێرەیی و ئیعتیبارییە. کەواتە "بەندە" داوای یەکێك لەو دوانە دەکات و، "خواوەند"یش کە خاوەن وەسفی هەردوو ناوی: "الهادي" و "المضـلّ"ە هیدایەت و گومراییەکە بەدیدەهێنێت، بۆیە خودی "بەندە"کە بە "ضـال" واتە "گومڕا" دادەنرێت. هەر لەبەر ئەمەشە کە لە نوێژەکانماندا و لە کاتی خوێندنی سوورەتی "فاتیحە"دا دەڵێین:

﴿غير المغضوب عليهم ولا الضالين﴾(الفاتحة:٧).

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:

"المغضوب عليهم": جوولەکەکانن.. "الضالين"یش: گاورەکانن[1].

جا لەبەر ئەوەی باسەکە گەیاندینیە ئەم شوێنە، با کەمێك لەسەر پلە و واتاکانی هیدایەت ڕابوەستین نەوەکو بە هەڵە لێی تێ بگەین.

* * *

(١) موسنەدی ئیمامی ئەحمەد ص ٣٧٨.

بەشی سێهەم

# پەیوەندیی نێوان:
# قەدەر، ئیرادە، هیدایەت

پێمان وایە "هیدایەت" بەپێی باسەکەمان دوو پلە یان دوو جۆرە:
یەکەمیان: ئەو هیدایەتە جەبری‌یەی کە بەپێی خواستەکانی شەریعەتی فیطـــری لەکاردایە.
دووهەمیان: ئەو هیدایەتەی کە ویستی مرۆڤی ڕەچاو کردووە.

**١ - ئەو هیدایەتەی کە بەپێی خواستەکانی شەریعەتی فیطری لەکاردایە.**

هەر بوونەوەرێك کاتێ بەپێی یاساکانی بەدیهاتنی ڕوو دەکاتە ئەو ئامانجەی بۆی دیاری کراوە، بە چەشنێکی "ئیجباری" بەرەو ئەو ئامانجە دەکەوێتە ڕێ و دەڕوات. ڕاستتر وایە ئەم ڕێبڕینە ناو بنێین "ڕاپێچانی خوایی"(االسَّوْق الإلهي).
هەر لە یەکەم هەنگاوی بەدیهێنانی مرۆڤەوە و ئنجا گەشەکردنی لە ڕەحمی دایكدا تا دەبێت بە زەروو، ئنجا کاتێ کە بەناو یەك لە دوای یەکی قۆناغەکانی ئاوملەدا تێ دەپەڕێت و لە هەر یەکەیاندا ئاڵوگۆڕی تایبەتیی بەسەردا دێت.. هەموو ئەمانە، بەپێی ئەو ڕاپێچانە خوایی‌یە ئەنجام دەدرێن. سەرجەمی بوونەوەرانی تریش بە هەمان جۆرن و تێکڕا بەپێی سوود و بەرژەوەندی‌یەکانیان دەڕۆن و ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت کە ئەمەش لەم ڕۆژگارانەماندا لای هەموان ئاشکرا و زانراوە.
خۆ هەرچەندە ماددی و سروشتی‌یەکان ناوی "غەریزە" یان "ڕاپێچانی سروشتی"یان لەم کارە ناوە، کەچی جیهانی "ویجدان" یەكدەنگە لەسەر ئەوەی کە ئەمە ڕاپێچانێکی خوایی‌یە.
لە ڕاستی‌دا "بەڵگەی هیدایەت" یەکێکە لە بەڵگەکانی "تەوحید" و بابەتێکی سەربەخۆیە و، هەرچی بەپێی ئەم ڕاپێچانە خوایی و هیدایەتە پەروەردگاری‌یە ڕوو دەدات، دەیبەستێتەوە بە "بوون" و "یەکتایی" خوای گەورەوە.
هەموو شتێك، هەر لە گەردیلەکانەوە تا دەگاتە گەلەستێرەکان بەم ڕاپێچانە خوایی‌یە ئەرکەکانی ئەستۆیان ڕادەپەڕێنن. واتە هەر لەو ئەلیکترۆنانەی کە بە دەوری ناوکی گەردیلەدا دەسووڕێنەوە تا دەگاتە هەسارە و ئەستێرە و گەلەستێرە مەلەوانەکانی

ناو بۆشایی ئاسمان، تێکڕا بەپێی ئەو نەخشە و پلانە دەڕۆن و دەجووڵێنەوە کە خوای گەورە بۆی کێشاون و، بێ ئەوەی بە ئەندازەی سەری پەنجەیەکیش لێی لابدەن، تێدەکۆشن بگەنە ئەو ئامانجە..

مریشك بەسەر هێلکەکەیدا کڕ دەکەوێت و بە چاوەڕوانیی تەواوبوونی ماوەی کڕکەوتنەکەیەوە ئارام لەسەر برسێتی و تینوێتی و گەرمای زۆر دەگرێت و شوێنەکەی خۆی بەجێ ناهێڵێت! ئایا ئەم مریشکە دەزانێت هێلکەکانی چی هەڵدەهێنن؟ یان بۆچی ئەم هەموو ئەرك و ماندووبوونە هەڵدەگرێت؟ لە کاتێکدا دەزانین کە دوای ئەوەی جووجەڵەکانی گەورە دەبن، دەریاندەکات و نایەڵێت ئەو دانانە بچنەوە و هەڵی بگرن کە خۆی دەیەوێت بە دەنووکی هەڵیان بگرێت! وەڵامی ئەم پرسیارانە سەبارەت بە ئێمەوە ڕوونە، ئەویش بریتییە لەوەی کە: خوای گەورە ڕووەو ئەو کارانە ڕاپێچی دەکات و دەیداتە بەر.

پاشان جووجەڵەی ناو هێلکە هەر ئەوەندەی کاتی ئەوەی دێت بێتە دەرەوە، بە دەنووکە نەرم و ناسکەکەی دیواری هێلکەکە کون دەکات و دێتە دەرەوە بۆ ناو ژیانێکی گەلێ فراوانتر لەوەی ناو هێلکەکە. ئایا لە کوێوە هەستی کرد و چۆن زانیی کە ژیانێکی تری نوێ هەیە تا هەموو هەوڵێکی خۆی خستە کار لەناو هێلکەکە بێتە دەرەوە و بەو ژیانە نوێیە بەهرەمەند ببێت؟

هەروەها مناڵ کە تازە لە دایك دەبێت، خۆی دەنووسێنێت بە سنگی دایکیەوە تاکو مەمکەکانی بمژێت! ئەی ئایا کێ سنگی ئەو دایکەی لە شیری پوخت و خاوێن بۆ پڕکرد؟ پاشان ڕێنمایی ئەو منداڵەی کرد کە شیر لەو مەمکانەدایە؟ کێ منالەکەی فێری مەمكمژین کرد؟! وەڵامی ئەمانە و پرسیارەکانی تری هاوچەشنیان تەنها ئەو تاقانە وەڵامەیە کە: هەموو ئەوانە بە ڕاپێچانی خوایی ڕوو دەدەن.

قورئانی پیرۆز لە زۆر شوێنیدا ئەم ڕاپێچانە خواییەمان دەخاتەوە یاد، ئەم ئایەتانەی - بۆ نموونە - لێ باس دەکەین:

أ - **﴿وأوحى ربُّكَ إلى النَّحلِ أنِ اتَّخِذِي مِنَ الجِبَالِ بُيُوتاً ومِنَ الشَّجَرِ ومِمَّا يَعرِشُونَ﴾**(النحل:٦٨).

بەڵێ، هەنگ بەم چەشنە ڕێنمایی و فێرکردن و هیدایەتە فێری دروستکردنی هەنگوین بووە. چونکە خوای گەورە فەرمان بۆ هەنگ دەردەکات کە لە چیاکاندا و لەناو درەختەکاندا خانە و لانە بۆ خۆیان بنیات بنێن. هەنگ لەم فەرمان و ڕێنماییە خواییەوە فێری دروست کردنی شانەی هەنگوین دەبێت. خۆ ئەو ئەندازیارییەی کە

هێندەی پێ نەچوو مێروولەکانی ئەو شارە مێروولەیەی کە یەکێکیان لێ ون بووە، ڕوویان کردە شارە مێروولەکەی تر و بەسەر چیلکەیەکەوە کە لەسەر چاڵەکە دانرابوو، هەموویان پەڕینەوە ئەوبەر و هێرشیان کردە سەر شارە مێروولەکەی تر!

ئایا کێ هەواڵی بەم شارە مێروولەیەدا کە یەکێکیان دیار نییە و لە شارە مێروولەکەی تردایە؟

پسپۆڕەکان بەم جۆرەی خوارەوە ئەم مەسەلەیە لێكدەدەنەوە، دەڵێن:

ئەو مێروولەیەی کە خرایە شارە مێروولەکەی ترەوە، بە چەشنێکی پەنهان و لە ڕێی دروستکردنی چەند شەپۆلێکی کارۆموگناتیسی و بە چەند ئیحداثیەیەکی دیاریکراو، هاوڕێکانی خۆی لەو بەسەرهاتانە ئاگادار کردووەتەوە کە هاتوونەتە ڕێی. جا دوای ئەم گفتوگۆیەی کە زۆر بە پەنهانی لە نێوان خۆی و هاوڕێکانیدا ڕووی دا، داوای لێ کردن بێن بە هانایەوە و ڕزگاری بکەن، بۆیە ئەوانیش هێرشیان بۆ سەر شارە مێروولەکەی تر بردا!

کەواتە مێروولە دەدوێت و قسە دەکات. خوای گەورەش "حەزرەتی سولەیمان"ی - درودی لەسەر بێت - شارەزای زمانی مێروولە کردبوو، بۆیە - وەك ئایەتەکە فەرموویەتی - زەردەخەنەیەك ڕوخساری پیرۆزی ئەوی گەشاندەوە و، ڕووی کردە پەروەردگاری و، بەوپەڕی گەرموگوڕی شوکری ئەم نیعمەتە مەزنەی پێشکەش کرد!

مێروولە سیستەمێکی کۆمەڵایەتییان هەیە کە لە ڕژێمی کۆماری دەچێت، چونکە هەموویان بۆ کۆکردنەوەی خۆراك لە شارەکەیاندا ماندوو دەبن و تێدەکۆشن. تەنانەت یەك مێروولەی تەمبەڵ یاخود کەمتەرخەمیشیان تێدا نییە. خۆ ئەگەر کۆڵی هەر کامێکیان قورس بێت، بانگ لە هاوەڵەکانی دەکات و ئەوانیش هاوکاریی دەکەن لە گواستنەوەی خواردنەکەدا بۆ ناو شارەکەیان. بە درێژایی هاوین مێروولەکان لە کار و کۆششی سەرومڕدان، بەڵام لە وەرزی زستاندا دەرگاکان دادەخەن و خۆراکە پاشەکەوتکراوەکەیان سەروزیادە. هەندێ جار دەنکە دانەوێڵە پاشەکەوتکراوەکان تەڕ دەبن یان شێ دەگرن و پێویست دەکات بخرێنە بەر خۆر، خۆ دوای وشکبوونەوەشیان جارێکی تر دەیانگوێزنەوە بۆ ناو شارەکەیان. هەندێ جاری تر بەشێك لەو دانەوێڵانە چەکەرە دەکەن و سەوز دەبن، یەکسەر مێروولەکان دەیکەن بە دوو کەرتەوە، خۆ گەر هەر کام لەو کەرتانەش سەوز بێتەوە، یەکسەر ئەویش دوو کەرت دەکەنەوە! بەم جۆرە لە چوارچێوەی سوودوەرگرتندا پارێزگاری لەو دەنکە دانەوێڵە پاشەکەوتکراوانەیان دەکەن، چونکە ئەو دەنکانەی کە سەوز دەبن و دەڕوێن تازە ئەوان سوودی لێ نابینن!

ئایا كێ هەموو ئەمانەی فێری مێروولە كرد؟ كێ ئەم مەسەلە ورد و تێكەڵ و پێكەڵانەی فێر كردن لە كاتێكدا كە جەستەی مێروولە لە بارستایی هێزی "حافیظە"ی ناو مێشكی ئێمە بچووك ترە؟

حەزرەتی ئەبوو هورەیرە - خوا لێی ڕازی بێت - دەفەرمویٚ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: (جارێكیان مێروولەیەك یەكێك لە پێغەمبەرانی گەست، ئەویش فەرمانی دا شارە مێروولەكەیان سووتاند، یەكسەر خوای گەورە وەحیی بۆ نارد كە: نەتەوەیەكت سووتاند تەسبیحاتی خوایان دەكرد)[١].

بەڵێ، هەروەك لە بەرچاودایە، مێروولە نەتەوەیەكی سەربەخۆن و بە زمانێك كە ئێمە لێی حاڵی نابین، تەسبیحات بۆ خوای گەورە دەكەن.

لە ڕیوایەتێكی حاكمدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (جارێكیان یەكێك لە پێغەمبەران - علیهم السلام - ڕۆشتە دەرەوەی شار بۆ نوێژەبارانە، مێروولەیەكی بینی دەست و قاچەكانی بەرەو ئاسمان بەرز كردبووەوە، یەكسەر بە خەڵكەكەی فەرموو: بگەڕێنە دواوە! چونكە لەبەر ئەو مێروولەیە وا خوای گەورە هات بە هاناتانەوە و دوعای گیرا كردن)[٢]!

كەواتە مێروولە بە ڕاپێچان و ئیلهامی خوایی هەموو ئەو كارانە ئەنجام دەدات.

ج - قورئانی پیرۆز سەرنجی ئێمە بۆ ڕووی "ئیجباریی قەدەر" و بۆ لای ئەوەش كە زیندەوەران چەند نەتەوەیەكی وەك ئێمەن، ڕادەكێشێت:

﴿وَمَا مِن دَابَّةٍ فِي الأَرضِ وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيهِ إِلاَّ أُمَمٌ أَمثَالُكُمْ مَا فَرَّطْنَا فِي الكِتَابِ مِن شَيءٍ ثُم إِلَى رَبِّهِم يُحشَرُونَ﴾(الأنعام:٣٨).

ئەبوو داوود ئەم فەرموودەیە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕیوایەت دەكات كە فەرموویەتی: (ئەگەر سەگ نەتەوەیەك نەبوونایە لە نەتەوەكان، فەرمانم بە كوشتنی هەموویان دەدا، بەڵام تەنها ڕەشە دڕندەكانیان بكوژن)[٣].

زانایان بە كۆتایی پێهاتنی وەچەی ئەو جۆرە قەلەڕەشانە نیگەران بوون كە لە توركیادا پێی دەوترێت: (Kelaynaklar) چونكە هەموو بوونەوەرێك لە ڕاگیر كردنی هاوسەنگیی ژینگەدا بارێكی دیاری كراوی هەیە. خۆ نەمانی وەچەی ئەو چەشنە قەلەڕەشەش ئەوە دەگەیەنێت كە كەلێنێك كەوتبێتە ئەو هاوسەنگییەوە! ئایا كێ هەموو

---

(١) رواه البخاري: الجهاد ١٥٣.

(٢) المستدرك: ٣٢٥/١ قال الحاكم: هذا صحيح الإسناد و لم يخرجاه و وافقه الذهبي.

(٣) الدارمي: الصيد ٣.

بوونەوەرێکی فێر کردووە کە جێی خۆی لە ڕاگیر کردنی هاوسەنگیی ژینگەدا بدۆزێتەوە؟

ئێمە بەم مەسەلەیە دەڵێین: "هیدایەتی جەبری" یان ئەو هیدایەتەی کە بەپێی خواستەکانی شەریعەتی فیـــــطری کار دەکات. هەروەها لەم گۆشەیەوە هەڵیان دەسەنگێنین.

**٢ - ئەو هیدایەتەی کە ویستی مرۆڤ ڕەچاو دەکات.**

خوای گەورە بە ناردنی چەندین هۆکاری هیدایەت و ڕێنمایی، خەڵکی هیدایەت دەدات.. ئنجا هەروەك پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - هۆکاری هیدایەتدانی خەڵکین، کتێبە نازڵ کراوەکانیش هۆکارێکی تری ئەو هیدایەتەن. هەروەها ئەو کەسانەش کە لە پێناوی تەبلیغ و ڕێنماییدا تێ‌دەکۆشن، چەند هۆکارێکن بۆ هیدایەت، بەم واتا و مەبەستە.

دەبێ بیشزانین کە هەرچەند خوای گەورە گەلێ هۆکاری هیدایەتی ناردووە، کەچی زۆر لە خەڵکی ناکات کە ئەم هۆکارانە وەربگرن، واتە ناچاریان ناکات لە ڕێی ئەم هۆکارانەوە ئیمان بهێنن. هەر لەبەر ئەمەشە کە هەندێ جار کەسی وا بووە هەرچەند لەناو خاوخێزانی پێغەمبەرانیشدا ژیاوە کەچی ڕێی هیدایەتی نەگرتووەتە بەر، یان نەیاری "هیدایەت" بووە! هەندێ جاری تریش لە کۆشکی فیرعەوندا "ئیمانداری ئالی فیرعەون" و "ئاسیا" پەروەردە بوون و ڕێی هیدایەتیان گرتووەتە بەر! چونکە ئەم جۆرە هیدایەتە ویستی مرۆڤی تێدا ڕەچاو دەکرێت. ئەوەتا خوای گەورە هەموو هۆکارەکانی هیدایەت بەدی‌دەهێنێت، بەڵام بەدیهێنانی خودی "هیدایەت" دەبەستێتەوە بە "ویست"ی خودی مرۆڤەکەوە، ئەو ویستەی کە ماهییەتەکەی نازانرێت و شتێکی نیسبی‌یە، بەڵام مەرجێکی عادی‌یە بۆ بەدیهێنانی ئەو هیدایەتە.

قورئانی پیرۆز لەم جۆرە هیدایەتەی بە زۆری تێدا باس کراوە، لێرەدا یەك‌دوانێکیان دەهێنین:

١ - ﴿وأما ثَمُودُ فهدَيناهم فاستحبُّوا العَمى على الْهُدى فأخذَتْهُم صاعِقَـــةُ العـــذابِ الْهُونِ بما كانوا يكْسِبون﴾(فصلت:١٧).

واتە: "هیدایەت" بە قەومی ئەموود گەیشت، کە حەزرەتی صالح بووە - درووودی لەسەر بێت - کەچی ئەوان، بە ویستی خراپی خۆیان، گومڕایی‌یان پێ باشتر بوو، بۆیە بە "لەخۆبایی‌بوون" و "فیز و دەمار"ەوە پشتیان لە هیدایەت هەڵکرد و لێی هەڵگەڕانەوە، تا گرفتاری دۆزەخ و سزای سەختی کردن.

٢ - خوای گەورە گەلێ پێغەمبەری بۆ لای خەڵكی ناردووە، تاكو بیانوو بۆ ئەو كەسانە دروست نەبێت كە بە ویستی خۆیان لە ڕێ لادەدەن و گومڕا دەبن:

﴿رُسُلاً مُبَشّرِين ومنذِرِين لئَلاّ يكونَ للنّاسِ على الله حجةٌ بعد الرُّسلِ وكانَ اللهُ عزيـزاً حكيماً﴾(النساء:١٦٥).

كەواتە ئەوانەی ڕێیان ون كردووە هیچ بەهانە و بیانوویەكیان بۆ گومڕایی‌یەكەیان بە دەستەوە نی‌یە، چونكە یەك لە دوای یەك پێغەمبەران - عليهم السلام - ڕەوانە كراون و ئەوانیش بە ڕوونی و درەخشانی حەقیقەتەكانیان بە خەڵكی ڕاگەیاندووە و ئەنجامی ناهەمواری كردەوە خراپەكانیان بۆ ڕوون كردوونەتەوە، هەروەك چلەپۆپەی ئەو كەمالاتانەشیان بۆ باس كردوون كە مرۆڤ لە ڕێی كردەوە چاكەكانەوە پێیان دەگات:

﴿إنّا أرسلْناكَ بالحق بشيراً ونذيراً وإنْ من أُمّةٍ إلاّ خَلا فيها نذير﴾(فاطر:٢٤).

بەڵێ، هەرچی نەتەوە هەیە پێغەمبەری مژدەدەر و ترسێنەریان بۆ ڕەوانە كراوە، كە ئەوانیش حەقیقەتەكانیان بەو نەتەوانە ڕاگەیاندووە. خوای گەورەش هیدایەتی بۆ ئەوانە بەدی‌هێناوە كە بە ویستی خۆیان گوێ‌بیست و گوێ‌ڕایەڵی ئەو پێغەمبەرانە بوون. خۆ ئەوانەش كە گومڕایی‌یان پێ باشتر بووە، ئەوا لەو گومڕایی‌یەدا ماونەتەوە كە خوای گەورە ویستوویەتی تیای‌دا بن.

﴿وَما كُنّا مُعذّبينَ حتى نَبعَثَ رَسُولاً﴾(الإسراء:١٥).

بەڵێ، خوای گەورە گەلێ پێغەمبەری ڕەوانە كردووە، تاكو ڕێی بەهانە و بڕوبیانوو بۆ كەس نەمێنێتەوە. ئەو پێغەمبەرانەش - درووودیان لەسەر بێت - بۆ نەتەوەكانیان بوون بە ڕێ‌پیشاندەر و ڕێگایان بۆ ڕوون كردوونەتەوە. بەشی نەتەوەی ئێمەیش لەم ڕێنمایی‌یەدا: خۆری ئاسمانی پێغەمبەرایەتی و سەرداری پێغەمبەران و سەروەرمان حەزرەتی محمدە ﷺ. بۆیە هەرگیزاوهەرگیز هیچ بەهانە و بیانوویەكمان لە بەردەم خوای گەورەدا بە دەستەوە نی‌یە، چونكە دەنگی پێغەمبەر ﷺ دەبیستین و هەست بە هەناسەی پیرۆزی دەكەین، بە هەمان جۆر ئایەتە مەزنەكانی قورئانی پیرۆزیش ڕۆحەكانمان ڕووناك دەكەنەوە و بەردەوام ویجدانمان بەخەبەر دێنن.

جگە لەمانەش خوای گەورە بە فەزڵ و كەرەمی خۆی "سەری هەموو سەد ساڵێك كەسێك بۆ ئەم نەتەوەیە دەنێرێت كە كاروباری ئایینەكەیان بۆ نوێ بكاتەوە"[1] و

(١) أبو داود: الملاحم ١.

دەروونە کانمان لە چڵك و چەپەڵی پاكژ بكات و مرۆڤی هەموو سەردەمێك بەهۆی ئەو نوێكارانەوە ژیانی ئایینیی خۆیان نوێ بكەنەوە و ژیانی بە بەردا بیوژێننەوە. خوای گەورە هەموو ئەمانە لەگەڵ مرۆڤدا دەكات، كەچی هێشتا سەرباری ئەمانەش هەر ویستی مرۆڤ ڕەچاو دەكات.. واتە هەرچەند خوای گەورە خۆی بەدیهێنەری هیدایەت و هۆكارەكانی هیدایەتە، كەچی هیدایەتدانی "بەندە"ی بەستووەتەوە بە داواكردنی بەندەكە خۆیەوە. كەواتە لێرەدا بە هیچ جۆرێك "هیدایەتی ئیجباری" لە گۆڕێدا نییە.

هەندێ جاری تریش خوای گەورە ڕاستەوخۆ هیدایەت و گومڕایی بەدیدەهێنێت و قابیلییەت و ئەهلییەتی ئەو كەسانە ڕەچاو دەكات:

ئەوەتا خوای گەورە پێغەمبەرە خۆشەویستەكەی ﷺ ڕەوانە دەكات، ئنجا پێغەمبەر ﷺ ئاینەكەی بە "حەزرەتی ئەبوو بەكر" ڕادەگەیەنێت، یەكسەر ئەویش بێدواكەوتن و بێ ئەوەی بەهەڵەدا بچێت، ئیمان دەهێنێت و دڵی بە نووری ئەم ئیمانە ڕووناك دەبێتەوە و بۆ سەر لوتكەی "صیددیقییەت" سەر دەكەوێت..

هەروەها خوای گەورە پێغەمبەرە خۆشەویستەكەی ﷺ ڕەوانە دەكات، كەچی ئەم جارە "ئەبوو جەهل" ڕووبەڕووی دەبێتەوە و، خوای گەورەش سەبارەت بەو "گومڕایی" بەدیدەهێنێت. چونكە بە زانستی ئەزەلیی خۆی دەزانێت كە: ئەبوو جەهل ئەهلییەتی هیدایەتی تێدا نییە، ئەویش بە كردارە گومڕاییەكانی خۆی تەصدیقی ئەم حوكمە دەكات و كوفر و بێ‌ئەزانینی خۆی ڕۆژ بە ڕۆژ زیاد دەكات و پتر دەكەوێتە خوارەوە تا لە غەزای بەدردا لە خوێنی خۆیدا دەگەوزێت[1].

٣ - قورئانی پیرۆز لە یەك ئایەتدا هەردوو جۆرەكەی "هیدایەت" كۆ دەكاتەوە و سەرنجیان بۆ لا ڕادەكێشێت:

﴿والله يدعُوا إلى دار السلام ويَهدِي مَن يشاء إلى صِراطٍ مُستقيم﴾(يونس:٢٥).

خوای گەورە لە ڕێی چەندەها هۆكاری جۆراوجۆرەوە خەڵكی بۆ لای هیدایەت و ڕێی ڕاست بانگ دەكات، بەڵام هیدایەت دەبەستێتەوە بە ویستی خۆیەوە، ئەوەی خۆی ویستی لەسەری بێت هیدایەتی بدات، دەیدات و.. بیەوێت هەر كەسێكیش گومڕا بكات، دەیكات. تەنها لایەنێكی بچووك لە مەسەلەكەدا بۆ مرۆڤ دەگەڕێتەوە، ئەویش لەوەدایە كە ئەگەر بەدەم بانگەوازەكەی خوای گەورەوە ڕۆشت و هەوڵی دا سوود لە

(١) البداية والنهاية لابن كثير: ٢٨٧/٣.

بەشی چوارەم

# چەند پرسیار و وەڵامێك لە بارەی "قەدەر"ەوە

**پرسیاری یەکەم:**

مەبەست چی‌یە لە: ﴿ألستُ بربّکم قالُوا بَلی﴾دا؟

**وەڵام:**

ئەم وشانە بەشێکن لەو عەهد و پەیمانەی کە بەدیهێنەر لە بەدیهێنراوان، بە تایبەتی لە مرۆڤی وەرگرتووە. چونکە وەڵامی ﴿بلی﴾ بەرامبەر بە پرسیاری: ﴿ألستُ بربّکم﴾ بووە.

ئەم مەسەلەیە دوو ڕووی هەیە:

یەکەم: ئەم پرسیارە لە کێ و چۆن کراوە؟

دووهەم: چ کاتێك کراوە؟

دەتوانرێت ئەم تێبینی‌یانەی خوارەوە سەبارەت بە ڕووی یەکەم پێش‌چاو بخرێن:

أ – ئەمە پرسیار و وەڵام و پەیمانێکە لە ماهییەتێکی "تەکوینی"دا و، کاتێ ئەم پەیمانە لە مرۆڤ وەرگیراوە کە هێشتا هیچ نەبووە و نەهاتووەتە "وجوود". وەڵامدانەوەشی بە ﴿بلی﴾ لە بەرامبەر ئەو فەرمانەی خواوەندەوە بووە کە بۆ "هێنانە وجوودی" ئەم دەری کردووە.

ب – کاتێ مرۆڤ کە لە جیهانی "گەردیلەکان" بەڵکو لە جیهانی جوزئیياتی گەردیلەکان‌دا بووە، پەروەردگاری هەموو جیهانەکان کە هەموو شتێك بەرەو کەماڵ دەبات ئەم گەردیلانەشی داوەتە بەر و شەوقی داونەتێ کە ببن بە مرۆڤ. ئەمەش وەرگرتنی عەهد و پەیمانەکەیە.

واتە ئەو عەهد و پەیمانە کۆڵنانێکە لە ئەستۆی گەردیلە کە زۆر لە سەرووی وزە و توانای خۆیەوەیە. وتنی: ﴿بلی﴾یش لە بەرامبەر تەکلیف لێ کردنی پەروەردگارەوە بووە بە ئیجاد کردن و هێنانەدیی ئەو گەردیلەیە.

جا ئەم پرسیار و وەڵام و تەکلیف و قبوولەی کە لەسەر ئەم شێوەیە بووە، وەك دیارە، لە شکڵ و شێوەی قسە و گفت‌وگۆدا نەبووە، بۆیە بەشێك لە تەفسیرنووسان وەك "ئیستیعارەی تەمثیلی" ڕوانیویانەتە ئەم گفت‌وگۆیە. واتە وەك بڵێی (ئاوا وترا و بەو

جۆرەش وەڵام درایەوە)[1]. هەر بەمەش ئەم گفتوگۆیە بەهای یاسایی خۆی بەدەست هێنا، دەنا پەیمانێك نی‌یە کە بە قسە و گفتوگۆی ڕوون و ئاشکرا وەرگیرابێت.

لە ڕاستی‌دا گەیشتن بەم حوکمە، بێ گوێدانە سەیرکردنی پێرستی گوفتار و وەڵامی پەروەردگاری عالەمیان کە هەزار و یەك گوفتار و وەڵامی هەیە، هەرگیز لە هەڵە بەدەر نابێت. پشت بەخوا ئەمە لە شوێنی خۆی‌دا باس دەکەین.

ج — ئەم جۆرە داواکردنەی پەروەردگار لە مرۆڤ بۆ: "دان پێدانان" و "پەیمان لێ وەرگرتن"ی -لە ڕاستی‌دا- بریتی‌یە لەوەی کە مرۆڤ خۆی بناسێت و بزانێت غەیری خۆی لە مەسەلەی ئەودا هەیە و تەنها خۆی نی‌یە. هەروەها بریتی‌یە لە: ناسینی "نەفس" و نموونە هێنانەوەیە بۆ حەقیقەتی: "مَنْ عَرَفَ نفسَهُ فقد عرفَ ربَّهُ"[2]. بەوەی کە ئاوێنەی ماهییەتی مرۆڤ دەخاتە بەرچاو، بەمەش دەبێت بە شایەت لەسەر ئەو حەقیقەتە جۆراوجۆرانەی کە لەسەر ئاوێنەی هەست و شعووری‌دا دەردەکەون و، پاشان ڕاگەیاندنی ئەم شایەتی‌یەیە. دەبێ بیشزانین کە تێگەیشتنی ئەم ئیجاب و قبووڵ و یادخستنەوە و بێدارکردنەوەیە ئاسان نی‌یە و لەوانەیە لەو جۆرە شتانە بێت کە پێویستیان بە بێدارکردنەوەی زۆر هەیە تاکو مرۆڤ لێیان تێ بگات، ئا لێرەوەیە گرنگیی "ڕێنمایی" دەردەکەوێت.

ئەمانەتی "نەفس" یان "من"[3] بۆ ئەوە بە مرۆڤ دراوە کە خوای گەورەی پێ بناسێت و دان بە "بوون"ی‌دا بنێت. لە ڕاستی‌دا ئامانجی بوونی مرۆڤ تەنها ئەم زانین و دانپێدانانەیە! هەر لەبەر ئەوەیە کە مرۆڤ بە "بوون"ی خۆی دەبێت بە بەڵگە لەسەر "بوونی خوای گەورە" و، بە "سیفەتە جوزئی"یەکانیشی دەبێت بە بەڵگە لەسەر سامان و دەوڵەمەندیی ڕەهای خواوەند و، بە "کۆڵەواری" و "هەژاری"یەکەشی دەبێت بە بەڵگە لەسەر توانست و چاکەکاری‌یەکانی خوای گەورە. جا ئەم چاکە و بەخششە لە پێش‌دا خواوەند بە فەزڵی خۆی بە مرۆڤی دەبەخشێت، ئنجا ئەو زانین و

(١) ئیستیعارەی تەمسیلی لە ڕەوانبێژیی زمانی عەرەبی‌دا بەو جۆرە دەستەواژە مەجازی‌یانە دەوترێت کە لەبەر نیشانە و هۆیەکی تایبەتی لە واتایەکی تری جگە لە واتا ڕاستەقینەکەیان‌دا بەکارهێنران و، زیاتر لەو پەندانە دەگرێتەوە کە لەناو خەڵکی‌دا دەماودەمیان پێ دەکرێت. وەك ئەوەی کە دەڵێن: (بە یەك دەست چەپڵە لێ نادرێت)! (وەرگێڕ)

(٢) كشف الخفاء: ٣٤٣/٢. بڕوانە پەراوێزی ژمارە (١) لاپەڕە (٤٩). (وەرگێڕ)

(٣) مەبەست بە "من" لێرەدا خود(ذات)ی مرۆڤە، بەو واتایەی کا مامۆستا نورسی لە کتێبی (من)دا لێکی داوەتەوە. (وەرگێڕ)

هەست كردنەی كە ئەنجامی ئەم یەكەم بەخششەی خواوەندن - لە ڕاستیدا - ڕاگەیاندن و دانئانێكە لە لایەن مرۆڤەوە بە هەست كردنی بە بوونی خوای گەورە كاتێ سەیری هەموو بوونەوەرێك دەكات و، دانئانیشە بە نووری خوای گەورە لە هەموو ڕووناكییەكدا. ئەمەش واتای پەیمانی ﴿ألستُ﴾ و ﴿بلى﴾یە.

جا ئەم پەیمانە: ئیجاب و قبوولێكە و، ئەنجامی زانینی واتاكانی ئەو كتێبە مەزنەیە كە توانست و ویستی خوای گەورە نووسیویانە و، پەیبردنە بە نهێنییەكانی ناو دێڕی ڕووداوەكان.

**د** - دەبێ ئەم پەیمان و پرسیار و وەڵامە بەپێی شتانی جیسمانی(ماددی) هەڵنەسەنگێنرێن و مرۆڤ لەو ڕووەوە لێی تێنەگات، چونكە خوای گەورە بەپێی ماهییەتی هەموو یەكێك لە بەدیهاتووانی فەرمان بۆ یەك بە یەكیان دەردەكات و، گوێ لە دەنگی هەموویان دەگرێت و، ئاگای لێیانە و، هەریەكەشیان بەپێی جێ و شوێنی خۆیان دەچێت بەدەمیانەوە و خواستەكانیان بۆ دەهێنێتەدی. خۆ ئەگەر بمانەوێت بە زاراوەكانی "زانستی كەلام" ئەمە دەربڕین، دەڵێین: خوای گەورە هەروەك تێدەگات لە هەموو ئەو گوفتارانەی كە مرۆڤ بە لەهجە و زمانە جیاجیا و تەعبیرە جۆراوجۆرەكانیان دەیڵێن، بە هەمان جۆر لە گوفتاری هەموو بەدیهاتوویەكی تێدەگات و دەزانێت چی دەڵێت.. لە هەمان كاتیشدا بە چەندەها زمانی جیاجیا و لەهجەی جۆراوجۆر فەرمانیان بۆ دەردەكات و حەقیقەتەكانیان تێ دەگەیەنێت و ڕاستیی مرۆڤ و گەردوونیان بۆ ڕوون دەكاتەوە و، گوفتاری بەدیهاتووانی وەردەگرێت و عەهد و پەیمانیان لەگەڵدا دەبەستێت، بە چەشنێك كە ڕوونكردنەوە "گوفتاری"یەكانی خواوەند تەنها لەناو دەستەواژەی "كەلامی لەفظی"دا دەمێنێتەوە. پاشان جۆرەكانی گفتوگۆی خوای گەورە هەر لە ئیلهامی زیندەوەرانەوە تا دەگاتە ئیلهامی مەلائیكەت، هەموویان چەند جۆرێكن لە گوفتاری خوای گەورە كە ئەویش یەكێكە لە دەرەوشانەوەكانی "كەلامی نەفسی"[1].

---

(١) بۆ تێگەیشتن لە واتای: "كەلامی لەفظی" و "كەلامی نەفسی" بەپێی لێكدانەوەی زانستی كەلامی ئەهلی سونئەت و جەماعەت، دەڵێین: بە ئیجماعی نەتەوەی ئیسلام و تەواتور لە پێغەمبەرانەوە - درووديان لەسەر بێت - چەسپاوە كە خوای گەورە "دەدوێت". خۆ مەحالیشە بدوێت گەر خاوەنی سیفەتی "كەلام" نەبێت. كەلامیش - سەبارەت بە خوای گەورەوە - دوو واتای سەرەكیی هەیە: یەكەمیان ئەوەیە كە پێی دەوترێت: "كەلامی نەفسی". كە ئەو سیفەتیە هەر لە ئەزەلەوە زاتی خوای گەورە هەیەتی و بە جۆرێكە گونجاوە بۆ ئەوەی فەرمان و نەهییەكانی خواوەندیان پێ ئاراستە بكرێت بۆ كەسانی تر و، لە ڕێی وشە و دەستەواژەكانەوە دەردەبڕێن و، بریتییە لە ڕاستییەكی جیاواز لە ڕاستیی "زانست" و "ویست"ی خوای

ئەم جۆرە گوفتارەی خوای گەورە لە بازنەیەکی یەکجار فراواندا لەکاردایە، هەر لەو واریداتانەی کە دێنە ناو دڵی مرۆڤەوە تا دەگاتە جیهانی مەلائیکەت. ئەوەندە هەیە هەریەك لەو بازنانە لە "وەرگرتن و بەخشین"ی ئەو گوفتارەدا چۆنێتی‌یەکی تایبەتیی هەیە کە جیایە لە هی ئەوانی تر. بۆیە ناتوانرێ بزانرێت چی دێتە ناو بازنەیەکی دیاریکراو، هەروەها چیی تر لە بازنەیەکی ترەوە دەردەچێت.

لە ڕاستی‌دا ئیددیعاکردنی ئەوەی کە: "ئێمە دەتوانین لە هەموو شتێك تێ بگەین" هەڵەیەکی گەورەیە! چونکە ئێستا لەم سەردەمەدا هەستمان کردووە کە ئەو شتانەی دەیانزانین و پەی‌یان پێ دەبەین چەند دانەیەکی کەمن لە نێوان ملیۆنێك شتدا کە هیچیان لە بارەوە نازانین. هەر بە هەمان ئەندازەش دەتوانین شتان ببینین. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو جیهانەی دەیبینین و هەستی پێ دەکەین هەر بە هیچ دانانرێت لەچاو ئەو شتانەی کە نایانبینین و هەستیان پێ ناکەین!

خۆ گفت‌وگۆی پەروەردگاری جیهانەکان لەگەڵ گەردیلەکاندا و فەرمان دەرکردنی بۆ نیظام و سیستەمەکان و پێکهێنان و هەڵوەشانەوەی شتان لە لایەن ئەو خواوەندەوە، لە چەند دووری‌یەکی بەرز و بڵندی ئەوتۆدا جێ‌بەجێ دەکرێن کە لە تەرازووە بچووکەکانی ئێمەدا جێ‌یان نابێتەوە.

خوای گەورە پەیمان لە گەردیلەکان و، جوزئییات و، خانەکان و، جیهانی گەردیلە و.. لە ڕەحمی دایكدا و لە سەردەمی منالی‌دا، وەردەگرێت. ئێمە هەرگیز ناتوانین بە تەرازووەکانی خۆمان ئەم شتانە بە ڕوونی لێك‌بدەینەوە و هەڵیان بسەنگێنین بە تایبەت گەر ئەم گوفتارە ڕووبەڕووە لەگەڵ ڕۆحی مرۆڤ و ئەو ویجدانەدا بێت کە لەو ڕۆحەدایە.

ڕۆح(گیان)ی مرۆڤ خاوەنی وجوودێکی سەربەخۆیە، چونکە ئەمە زۆر بە ڕوونی لەم سەردەمەی ئێستادا چەسپاوە، بە چەشنێك کە بواری موناقەشەی تێدا نەماوە. چونکە لقە جۆراوجۆرەکانی زانستی پاراسایکۆلۆجی کە دەورانەوری جیهانی زانستیان داوە وای لەم بابەتە کردووە کە حەزی مرۆڤ بۆ زانینی ڕۆح و بوون و

---

گەورە و، سیفەتێکی ئەزەلی‌یە. بەڵام "کەلامی لەفظی" ئەو دەنگ و وشە و پیتانەن کە ئەو گوفتارەی خوای گەورەیان پێ دەردەبڕرێت و خواوەند لە "لەوحی مەحفووظ" و حەزرەتی جیبریل و هەر کەس و شتێکی تری غەیری خۆی‌دا بەدیی‌دەهێنێت. کە ئەمەیان بەدیهاتووە و ئەزەلی نی‌یە و، بە زاتی خوای گەورەشەوە بەند نی‌یە. بڕوانە: (کبری الیقینیات الکونیة) نووسینی: (دکتۆر محمد سعید رمضان البوطي) ص ١٣٣-١٣٦ الطبعة الثالثة. (وەرگێڕ)

كارمەندی و ئاوات و ئارەزووەكانی ڕۆح بهەژێنێت. تەنانەت هیچ زانستگەیەك و كۆڕێكی چینە پێشكەوتووەكان نەماوە كە لە بارەیەوە نەدوێن. جا لەبەر ئەوەی لە شوێنێكی تردا لە بارەی "ڕۆح"ەوە دواوین ئەوا لێرەدا هەر هێندەی لێ دەدوێین كە پەیوەندیی بە باسەكەی ئێستامانەوە بێت.

ئێمە هەرگیز بەم تەرازووانەی كە بۆ تێگەیشتن و تێگەیاندن هەمانە، ناتوانین لەو ئیجاب و قبوولە تێبگەین كە پەیوەندیی بەو عەهد و پەیمانەوە هەیە، لەو ڕووەوە كە پەیمانێكە لەگەڵ ڕۆحدا بەستراوە، چونكە ڕۆح پێش جەستەی مرۆڤ بەدیهێنراوە. لە لایەكی تریشەوە ماهییەتی ڕۆح لە سەرووی كاتەوەیە. چونكە قسەكردنی ڕۆح وەكو ئەو قسە و هەستكردنانە وایە كە لە خەونەكاندا ڕوو دەدەن. هەرچەندەش دەتوانێت بێ ئەوەی پێویستی بە شەپۆلە دەنگییەكان بێت - بە وێنەی تەلیپاثی - گفتوگۆ و لەیەكحاڵیبوون ئەنجام بدات. خۆ بایەخدانی گەورە و زۆر بەم بابەتە، تەنانەت لە یەكێتیی سۆڤیەتیشدا - كە تەمسیلی جیهانی باوەڕ بە ماددییەت دەكات - ئەوە دەگەیەنێت كە گوفتار و قسەی تایبەتیی ڕۆح لە لایەن گرۆی مرۆڤەوە قبووڵ كراوە و باوەڕی پێ هێنراوە. جا ئەم قسەكردنە تایبەتەی ڕۆح لەوانەیە بە گوفتارێكی تایبەت بە خودی ڕۆحەوە، لە كاتێكی گونجاودا دەربكەوێت و، لە چەند ئامێرێكی تۆماركەری جیاوازدا تۆمار بكرێت و لە چەند كاسێتێكی ناوازە و جیادا هەڵبگیرێت و زمانی تایبەتیی خۆی بەكار بهێنێت.

جا لەسەر بناغەی ئەمە دەڵێین: لە شوێنی عەهد و پەیمانەكەدا ڕۆحەكان بۆ گفتوگۆ كردن لەگەڵ پەروەردگاری بەخشندەدا بانگ كراون و، ئەوانیش لەبەر ئەوەی كە بەرزەخی جیسمانییەت نەكەوتووەتە نێوان خۆیان و خوای گەورەوە ئەوا هەموو شتێكیان بە ڕوونی دیوە و، سەبارەت بەو پەیمانە وتوویانە: ﴿بلى﴾. بەڵام لەبەر ئەوەی زۆربەی خەڵكی ئەم ڕۆژگارەمان لە "بابی ویجدان"ی كتێبی "ڕۆح"دا بە شوێن ئەمەدا نەگەڕاون، ئەوا ڕێیان لەم پەیمانە نەكەوتووە و هەرگیز ڕێشیان لێی ناكەوێت! چونكە هەروەك لەو جیهانە بێ ئاگان، هێشتا باس و لێكۆڵینەوەشیان تێدا ئەنجام نەداوە.

لە ڕاستیدا ئەو كتێبە بێدەنگەی كە ئەم دوو فەیلەسووفە لێی دواون: یەكەم: "كانت" - بێ ئاوڕدانەوە لەو پێناسەیەی كە لە كتێبەكانیدا بۆ "بەدیهێنەر" كردوویەتی - و دووهەمیش: "بریگسۆن" كە پشتی كردە گەردوون تاكو ئەو كتێبە بێدەنگە بخوێنێتەوە و گوێی لێ ڕابگرێت، بریتییە لەم كتێبە. چونكە پێویست بوو گوێ لە ڕۆح و ئیلهامەكانی ڕابگرێت بۆ ئەوەی چەند ئەزموونگەیەك بۆ تێگەیشتن لە زمانی

"ویجدان" دامەزرێنێت و هەوڵ بدرێت لە ڕێی ئەو پیرستانەی کە لەسەر ئاوێنەی شعووردا دەردەکەون، ڕووی حەقیقەت پێش چاو بخرێت.

ئەم کتێبە خۆی لە خۆی‌دا شایەتێکی ڕاستی بێ‌درۆیە لەسەر ئەو حەقیقەتە بەرزە کە بریتی‌یە لەو عەهد و پەیمانە. دیارە تێگەیاندنی ئەو کەسانەی کە لەم زمانە بێ‌بەشن هەرگیز کارێکی ئاسان نی‌یە! خۆ ئەگەر ژیری‌یەکان واز لە خۆبەستنەوە و بڕیارەکانی پێشتریان بهێنن ئەوا مرۆڤ هەست بەو ﴿بلى﴾یە دەکات کە "ویجدان"ی خۆی بۆ ئەو پەیمانە کردوویەتی.

لە ڕاستی‌دا مەبەست لە بیرکردنەوەی "ئەنفوسی" و "ئافاقی" و باسەکانی سەبارەت بەمانە، هەر تەنها ئەمەیە کە باسمان کرد، چونکە زەینی مرۆڤ لە گومڕایی‌یەکانی خۆی ڕزگاری دەبێت و سەربەستی بە بیری خۆی دەدات و تێ‌دەکۆشێت کە بە زەڕەبینی بیری سەربەستانە نووسراوە وردەکانی ناو ویجدانی خۆی بخوێنێتەوە. زۆر کەس هەن کە خۆیان وا ڕاهێناوە لەم ڕێیەوە سەیری ناخی دڵی خۆیان بکەن. ئەو داهاتانەی کە ئەو جۆرە کەسانە بە بینین و هەستیارە ناسکەکانی ناخی خۆیان بەدەستی دەهێنن هەرگیز ناتوانن لە هیچ کتێبێکی تردا دەستیان بکەوێت. دەتوانرێت لە ژێر ئەم زەڕەبینەوە هێما و ئاماژەکانی کتێبە ئاسمانی‌یەکان بە ڕەنگە تایبەتی‌یەکانی خۆیان دەربکەون. جا ئەو کەسانەی کە ناتوانن ئەم ئاسۆیانە ببینن و لەناو چوارچێوەی دەروونی خۆیان‌دا قەتیس ماون و خۆیان لەوێ‌دا بەند کردووە و لەو قاوغ و چوارچێوەیە دەرنەچوون، هیچ کاتێك ناتوانن شتێك لەم قسانە حاڵی بن!

* * *

با ئێستا لە ڕووی دووهەمی پرسیارەکە بدوێین: چ کاتێك ئەم پەیمانە وەرگیراوە؟

دەبێ پێشەکی ئەوە ڕوون بکەینەوە کە لەناو دەقەکان‌دا ناتوانین شتێکی گومان‌بڕمان لەسەر ئەمە دەست بکەوێت. بەڵام دەتوانین ئەو شتانە بهێنین کە تەفسیرنووسەکان لەم بارەیەوە وتوویانە:

ئەم ئیجاب و قبوولە لە کاتی ڕۆشتنی زیندەتۆو (حیمن)ی مرۆڤ‌دا بووە بەرەو پیتاندن و.. لەو کاتەدا بووە کە ئاوەڵە (جنین) شێوەی مرۆڤی لەخۆ گرتووە.. یان ئەو دەمەی کە منداڵ دەگاتە تەمەنی ئاوزان و بالغ بوون. هەریەك لەم ڕا و بۆچوونانە شێوازی تایبەتی‌یان هەیە بۆ بەرگری لەخۆکردن. بەڵام گەلێ دژوارە کە هۆکارێکی یەکلایی‌کەرەوە بە دەستەوە بێت و یەکێك لەو ڕا و بۆچوونانەی پێ تەرجیح بدرێت.

جا هەروەك ئەم پەیمانە لە جیهانی گیانەکاندا ڕوویداوە، دەشکرێت لە کاتی پەیوەندی کردنی گیان بە گەردیلەکانی خۆیەوە لە جیهانێکی تردا ڕوو بدات.. هەروەك لە یەکێك لە قۆناغەکانی گەشەکردنی ئاوەڵمە لە ڕەحمی دایکدا ڕوویداوە، دەشگونجێت لە هەر قۆناغێکی گەشەکردندا تا کاتی بالغبوون ڕوو بدات.

خۆ ئەو خواوەندە گەورەیەی کە وەکو یەك لەگەڵ "ئەمڕۆ" و "دوێنێ" دەدوێت و بە وێنەی ئەمڕۆ لە دوێنێش ئاگادارە، لەوانەیە لە هەموو ئەم قۆناغانەدا پەیمانەکەی وەرگرتبێت. ئێمە لە قووڵایی ویجدانی خۆماندا دەنگێکی بەم جۆرە دەبیستین لەسەر ئاگاداری و شایەتیی دڵمان لەسەر ئەم پەیمانە.

هەروەك "گەدە" بە زمانی تایبەتیی خۆی برسێتییەکەی خۆی دەردەبڕێت و، "جەستە"ش، بە وشە تایبەتییەکانی، ئازارەکانی ڕادەگەیەنێت.. "ویجدان"یش بە هەمان جۆر، زمان و زاراوە تایبەتییەکانی خۆی دەخاتە کار و، باسی ئەو گفتوگۆ و عەهد و پەیمانانە دەکات و، بەدەست ئازار و دڵتەنگییەکانیشیەوە دەناڵێنێت. ئەم ویجدانە هەمیشە لە دڵەتەپێ و نیگەرانیدایە تاکو بە ڕاستگۆیی لەسەر گفت و پەیمانەکەی خۆی بمێنێتەوە و، لە شێوەی چەند شەپۆلێکی یەك لە دوای یەکیشدا ترپە و ئینفیعالاتەکانی خۆی دەردەخات. هەروەك منداڵ کە بە گریانەکەی سەرنجەکان بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت و خۆیشی لەمەدا بە "بەختەوەر" دادەنێت و، گەر نەشتوانێت ئەو داخ و خەمانەی دەربڕێت کە پێیانەوە دەناڵێنێت، ئەوا نائومێدی و دڵشکاویی پێوە دەردەکەوێت.. "ویجدان"یش بە هەمان جۆرە، چونکە ویجدان لە پێش چاوی ئەو کەسانەدا کە دەیخوێننەوە و هەستی پێ دەکەن:

ئاوێنەیەکی خاوێن و درەخشانە بۆ مەزنترین ڕاستییەکان و.. کتێبخانەیەکی یەکجار دەوڵەمەندە و.. تۆمارێکی تایبەتی و.. شوێنێکی بەرز و بڵندی ئەمبارکردن و تێداپاراستنی شتانە.

* * *

**پرسیاری دوروهەم:**

ئایا بەڵگەی عەقڵی هەیە لەسەر: ﴿ألستُ بربکم قالوا بلی﴾؟

**وەڵام:** هەندێ مەسەلە و بابەت هەن کە گەلێ سەخت و دژوارە بە عەقڵ و ژیری ڕوون بکرێنەوە. خۆ ئەگەر لە ڕێی ژیرییەوە خەڵکیان لێ تێ بگەیەنرێت ئەوا تەنها لەو ڕووەوە دەکرێت تێ بگەیەنرێن کە: ئەم بابەت و مەسەلانە لە جۆری "مومکینات"ن، واتە "مەحاڵ" نین.

لە ڕاستیدا مادەم خوای گەورە باسی کردووە، ئەوا هیچ ئیعتیرازێك ڕوو لەم مەسەلەیە ناکات.

دەتوانین لە دوو ڕووەوە لەم پرسیارە بدوێین:

١ - ئایا شتی وا ڕووی داوە؟ ئەگەر ڕووی داوە چۆن دەکرێ بچەسپێنرێت؟

٢ - ئایا کەسێکی ئیماندار ئاگاداری ئەم هەواڵەیە و بینیویەتی؟

پێش هەموو شتێك، ئایا پرسیاری: ﴿ألستُ بربكم﴾ کە خوای گەورە لە ڕۆحەکانی کردووە - ئیتر لە هەر جیهانێکدا بوو بێت -پاشان وەڵامی ڕۆحەکانیش: ﴿بلى﴾ پرسیار و وەڵامێکی قەطعی و بێ گومانە؟

ئەم مەسەلەیە لە دوو ئایەتی قورئانی پیرۆزدا باس کراوە:

یەکێکیان ئەم ئایەتەیە:

**﴿وإذْ أخَذَ ربُّك مِن بني آدمَ مِن ظهورِهم ذُرِّيَّتَهُمْ وأشهَدَهُم على أنفُسِهم ألستُ بِرَبِّكُمْ قالوا بلى﴾**(الأعراف:١٧٢).

کەواتە ئەم پەیمانە وەرگیراوە و بەسەرهاتەکەش ڕوویداوە. تەفسیرنووسان لە کۆن و نوێدا قسەی زۆریان لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا کردووە.. بەشێکیان وتوویانە: ئەم پەیمانە لەو گەردیلانە وەرگیراوە کە لە داهاتوودا مرۆڤیان لێ پێك دەهێنرێت و لە ڕۆحەکانیشیان پێکەوە.

هەندێکی تریان وتوویانە: لەو کاتەدا وەرگیراوە کە مناڵ دەکەوێتە ڕەحمی دایکیەوە.

چەند تەفسیرنووسێکی وردەکارتر پشتیان بە فەرموودەیەکی پیرۆز بەستووە و وتوویانە: ئەم پەیمانە لەو کاتەدا لە مرۆڤ وەرگیراوە کە فووی ڕۆح(ژیان)ی تێ کراوە.

لە ڕاستیدا قسە و گوفتاری خوای گەورە لەگەڵ بەدیهاتووانەدا گەلێ جیاجیا و جۆراوجۆرە. ئەوەتا ئێمە بە جۆرێکی تایبەتی و شێوەیەکی دیاریکراو دەدوێین، کەچی لەگەڵ ئەمەشدا جۆرە گفتوگۆیەکی ترمان هەیە کە هی هەستە ناوەکی و دەرەکی و ئاشکرا و پەنهانەکانمانن و، قسە و گوفتاری عەقڵ و ڕۆحمان هەیە و، جۆرە گوفتارێکی دەروونی و لەفزیشمان هەیە و، گەلێ جار بە هەموو ئەم زمانانە دەدوێین و هەولیش دەدەین ئەوانەشیان پێ تێ بگەیەنین کە لێیان تێ دەگەن.

ئەوەتا "دڵ" زمانی تایبەتیی خۆی هەیە قسەی پێ دەکات، بەڵام هەستی پێ ناکرێت. خۆ ئەگەر پێمان بوترێ: لە دڵی خۆتاندا چیتان دەوت؟ دەڵێین: ئاوا و ئاوا. هەروەها ئەو شتانەش دەگێڕینەوە کە لە دەروونماندا وتومانن، ئەمەش قسە و گوفتاری دەروونییە. هەندێ جاری تر لە خەونەکانماندا قسە دەکەین و لە خەڵکیش تێ دەگەین، کە هیچ کەسێکی تەنیشتی خۆمان هەستی پێ ناکات، پاشان کە لە خەو هەڵدەستین و

ر دەبینەوە یەك‌بەیەکی ئەو قسانە بۆ کەسانی تر دەگێڕینەوە، دیارە ئەمەش جۆرێکی ترە لە قسە و گوفتارەکانمان.

کەسانێکی تر هەن کە تابلۆکانی جیهانی میسالیان پیشان دەدرێن و لەگەڵ کەسانی جیهانی میسالیش‌دا دەدوێن و گفت‌وگۆ دەکەن. لەوانەیە هەندێ کەس لە ماددی‌یان باوەڕ بەمە نەکەن و بڵێن ئەمە وڕێنەیە. با وازیان لێ بهێنین! چونکە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ چەندین تابلۆی میسالیی جیهانی بەرزەخ و جیهانی میسال پێش‌چاوی بڵند و بەرزی پێغەمبەرانەی دەخرا و ئنجا هەموو ئەوانەش کە چاوی پێیان دەکەوت لێیان تێ‌دەگەیشت و هەستی پێ دەکردن و بۆ کەسانی تری دەگێڕانەوە. خۆ ئەمەش جۆرێکی تری گوفتارە.

بەڵام "وەحی" جۆرێکی تەواو جیایە لەمانە. ئەوەبوو کە وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ دەهات جگە لە خۆی کەسی تر هەستی پێ نەدەکرد و لێی تێ نەدەگەیشت. خۆ ئەگەر وەحی شتێکی ماددی بوایە و بە گوێ ببیسترایە، ئەوا کەسانی نزیکی دەیانبیست و هەستیان پێ دەکرد. کەچی کاتی وا دەبوو کە وەحیی بۆ دەهات سەری لەسەر ڕانی یەکێك لە خێزانەکانی، یان ئەژنۆی بە ئەژنۆی یەکێك لە هاوەڵە بەڕێزەکانیەوە دەبوو، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ لەو وەحی‌یە تێ‌دەگەیشت بێ ئەوەی کەسی تری جگە لە خۆی هەستی پێ بکات. ئنجا پێغەمبەریش ﷺ پێت بە پیتی ئەو وەحی‌یەی پێ ڕادەگەیاندن. خۆ ئەمەش دەنگ و قسە و گوفتارێکە لە شێوەیەکی تردا.

"ئیلهام" بۆ دڵی وەلی دێت و شتێك بە گوێی دڵی‌دا دەچرپێنێت، کە ئەمەش جۆرێکی تری گوفتارە و بە وێنەی زمانی مۆرس(بروسکە) وایە، کە چەند جارێکی دیاری‌کراو لێ دەدرێت و کارمەندی بەرپرسیاری بروسکە ڕاستەوخۆ لێی تێ‌دەگات. جا هەندێ شت بە هەمان جۆر لە دڵی وەلی‌دا دادەنرێت، ئنجا ئەویش لە لایەنی خۆیەوە چەندین واتای جیاجیای لێ دەردەهێنێت. بۆ نموونە وەك ئەوەی وەلی‌یەکە بڵێت: فلانی کوڕی فیسار کەس گەیشتە بەردەرگا، کە دەرگا بکەنەوە ببینن لەوێ‌یە و گەیشتووە! خۆ دیارە ئەمەش جۆرێکی تری قسە و گوفتارە.

ئنجا "تەلیپاثی"ش هەیە[1].. ئەوەتا زانایانی ئەمڕۆ بە ژمێرکاری و تاقیکردنەوەکانی خۆیان ڕێ بۆ ئەو ڕۆژە خۆش دەکەن کە پێیان وایە دەتوانن بە تەلیپاثی لەگەڵ یەکتردا بدوێن. کە ئەمەش جۆرێکی تری قسە و گوفتارە.

---

(١) (تەلیپاثی Telepathy): بریتی‌یە لە گۆڕینەوەی بیر و بۆچوون و لەیەکتر حاڵی‌بوون لە نێوان مێشکی چەند کەسێك‌دا، بە بێ بەکارهێنانی زمانی قسە و گوفتار. بڕوانە فەرهەنگی: Oxford. (وەرگێڕ)

ڕووتێکردنی دڵ لە دڵ و برووسکە بەیەكدانی مرۆڤ لە ناخەوە جۆرێکی تری دەربڕین و گفت‌وگۆیە.

لە هەموو ئەمانەوە کە باسمان کردن، تێدەگەین لەوەی کە خوای گەورە چەندین جۆری لەژمارەبەدەری قسە و گفت‌وگۆی بەدیهێناوە.

ئێستاش با بڕۆینەوە سەر باسەکەمان.

خوای گەورە بە ئێمەی فەرموو: ﴿ألستُ بربكم﴾؟ بەڵام ئێمە نازانین بە کام جۆر لە جۆرەکانی گوفتار فەرموویەتی. خۆ ئەگەر ئەم فەرمایشتەی لە شێوەی لێدانی مۆرس‌دا بوو بێت - دیارە ئەمە نموونەیە و، نموونەش قرە و برەی لەسەر ناکرێت - بە وێنەی قسەکردن لەگەڵ مرۆڤی وەڵی‌دا، ئەوا بێ گومان ناتوانین بە گوێ کانمان ئەم گوفتارە ببیستین. واتە ئەو گوفتارە "ئیلهام"ە و "وەحی" نی‌یە. خۆ ئەگەر "وەحی"یش بێت "ئیلهام" نی‌یە. گەر گوفتارەکەی ئاراستەی ڕۆح کردبێت ئەوا لەگەڵ جەستەی نی‌یە، ئەگەر ئاراستەی جەستەشی کردبێت ئەوا لە جۆری ئەو گوفتارە نی‌یە کە لەگەڵ ڕۆح‌دا دەکرێت.

ئەم خاڵە گەلێ گرنگە، چونکە کارێکی یەکجار هەڵەیە گەر ئەو شتانەی کە مرۆڤ لە جیهانی "میسال" و جیهانی "بەرزەخ" و جیهانی "ڕۆحەکان"دا دەیانبینێت و هەستیان پێ دەکات، بە تەرازووەکانی ئەم جیهانە هەڵبسەنگێنرێن. ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: "کاتێ بەندە خرایە گۆڕەکەی و هاوڕێیانی بەجێیان هێشت و ئەویش گوێی لە دەنگی پێیانە، ئا لەم کاتەدا دوو مەلائیکەت دێن بۆ لای و دای‌دەنیشێنن و پێی دەڵێن: بەرامبەر بەم پیاوە کە محمدە ﷺ لە دنیادا چیت دەوت؟"[1]. ئایا ئەم پرسیارە لە چ لایەنێکی ئەو مرۆڤە دەکرێت؟ خۆ چ لە جەستەی و چ لە ڕۆحی بکرێت، ئەنجامەکەی هەریەکێکە و ناگۆڕێت. گەر مردووەکەش هەست بەم گوفتارە بکات هەرگیزاوهەرگیز ئامادەبووانی دەوروبەری هەستی پێ ناکەن. تەنانەت گەر ئامێرێکی تۆمارکردنیش لە گۆڕەکەیدا دابنێن، ئەوا هەرگیز ناتوانن هیچ شتێك ببیستن. چونکە ئەو گفت‌وگۆیە لە چەند دووری(أبعاد)یەکی تری غەیری دووری‌یەکەی ئێوەدا ئەنجام دەدرێت، بە وێنەی دووری‌یەکانی چوارەم و پێنجەم و دووری‌یەکانی تری وەك ئەمانە کە ئەنیشتاین و غەیری ئەویش دۆزیویانەتەوە. مەسەلەکە - بە هەمان جۆر - بەپێی گۆڕانی جێ و شوێنیش دەگۆڕێت و بە شێوەیەکی تر لە بەردەمتان‌دا دەردەکەوێتەوە. کەواتە: ﴿ألستُ بربكم﴾ گوفتارێکی خوای گەورەیە کە بە ئاراستەکردنێکی تایبەتەوە

---

(١) رواه البخاري: الجنائز ٨٧.

لەگەڵ ڕۆحدا کردوویەتی. لەبەر ئەوە، نابێ چاوەڕوانی ئەوە بم کە پەی بە کاریگەریی ئەم گوفتارە لە خۆمدا ببەم، یان لەبەرم کردبێت و لە بیرم مابێت، بەڵکو لە شێوەی هەستکردنێکدا کە لە "ویجدان"ەوە سەری هەڵدابێت دەتوانرێت چاوەڕوانی ئەوە بکرێت. ئەوەتا ئێمە لە ڕێی ئەو ئیلهامانەی کە دێنە ناو ویجدانمانەوە هەستی پێ دەکەین.

لە کاتی ڕوونکردنەوەی ئەم مەسەلەیەدا، یەکێك پێی وتم:

- کوا؟ من هەستم بەمە نەکردووە؟

پێموت:

- بەڵام من هەستم پێ کردووە! خۆ ئەگەر تۆ هەستت پێ نەکردبێت ئەوە پەیوەندیی بە خۆتەوە هەیە. بەڵام من باش لە یادمە کە هەستی پێ دەکەم. گەر پرسیاریشم لێ بکرێت: بە چ شتێك هەستت پێ کرد؟ دەڵێم: بەو شەوق و تاسەمەندییەی کە لە ناخمدا دانراوە بەرەو "ئەبەد". خۆ هەرچەندە خۆم کۆتاییم پێ دێت، بەڵام لە ڕێی حەزو ئارەزووە بێ کۆتاییەکانمەوە ئەم دەنگەم بیستووە. لە ڕاستیدا لەبەر ئەوەی من سنووردار و پابەندم ناتوانم پەی بە بەدیهێنەری مەزنم ببەم، چونکە چۆن بتوانم دەرکی ڕەهای بێ کۆتایی بکەم؟ کەچی بەو حەز و ئارەزووە تاسەمەندەی کە بەرەو "ڕەها" و "پابەند نەبوو" لە خۆمدا هەستی پێ دەکەم، دەتوانم پەیی پێ ببەم. ئەوەتا مێروویەکی سنووردار لەم جیهانە سنوورداره و لە جیهانە بەرتەسکەکەی خۆیدا دەژی، کاتێکیش کە دەمرێت هەموو ئەو شتە سنووردارانەشی لەگەڵدا دەمرن کە لەناو ژیانی ئەودا بوون. منیش وەك ئەو لە جیهانێکی سنووردار و کۆتایی پێهاتوودا دەژیم. بەڵام بیر لە بێسنوور و بێ کۆتایی دەکەمەوە، حەز و ئارەزووشم بەرەو ئەبەد تێدایە و، شەوق و تاسەی "بەهەشت" و "بینینی جوانیی خوای گەورە"شم لە ڕۆحمدا هەڵگرتووە. خۆ ئەگەر سەرانسەری دنیا ببێت بە موڵکی من هێشتا ئەم خەم و حەز و شەوقەم لاناچێت. هەر لەبەر ئەمەش بوو کە وتم: "من هەستی پێ دەکەم". چونکە ئەم حاڵە لە خۆمدا شك دەبەم.

"ویجدان" هەرچییەك بێت، هەمیشە بە هەموو کوللییات و بەشەکانیەوە زمانی بە یاد و ذیکری خوا پاراوە و، هەرگیزاوهەرگیز درۆ ناکات. خۆ کاتێك ئەو شتەی پێ بدرێت کە دەیەوێت و ئارەزووی لێیەتی، یەکسەر دەسرەوێت و دڵنیایی بەدەست دەهێنێت. بۆیە دڵی مرۆڤ کە لایەنێکی ناسك و نیانی پەروەردگارییە لە مرۆڤدا، هەرگیز دڵنیایی بەدەست ناهێنێت هەتا ویجدان نەسرەوێت و نەکەوێتە دڵنیاییەوە. وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی بۆ دەکات:

﴿الذين آمنوا وتطمئن قلوبُهم بذِكرِ الله ألا بذِكرِ الله تطمئنُ القلوب﴾(الرعد:٢٨).

جگە لەمەش "بریگسۆن" و فەیلەسووفەکانی تری هاوچەشنی، لە بواری چەسپاندنی بوونی خوای گەورەدا وازیان لە هەموو بەڵگە عەقلی و نەقلی‌یەکان هێنا و تەنها "ویجدان"یان کرد بە بەڵگە لەسەری. تەنانەت "کانت" لە شوێنێکدا دەڵێت: (من هەموو زانیاری‌یەکانی خۆمم پشت گوێ خست و وازم لێ‌هێنان تاکو بەو شێوەیەی کە شایستەی مەزنایەتیی خوای گەورەیە، خواوەند بناسم)! "بریگسۆن"یش کاتێ کە دەیەوێت ئەم ڕێگایە بگرێتە بەر، تاقە بەڵگەی هەر "ویجدان"ە. ئەوەتا "ویجدان" گەلێ بە "ئینکاریی بوونی خوای گەورە" نیگەران دەبێت و، جگە لە "ئیمانهێنانی بە خوای گەورە" بە هیچ شتێکی تر ناسرەوێت و ئارامی و دڵنیایی بە خۆیەوە نابینێت.

مرۆڤ کاتێ کە گوێ لە دەنگی ئەو ویجدانە ڕادەگرێت کە لە ناخیەوە دەردەچێت، هەمیشە لەو دەنگەدا هەست بە بوونی پەرستراوێکی ئەزەلی و ئەبەدی دەکات. وەڵامی: ﴿بلی﴾ بریتی‌یە لەم حاڵ و دەربڕینەی کە بە چەند وشەیەکی بێ‌دەنگ لە ناخی ویجدانی مرۆڤدا خۆی دەرخست و وەڵامی: ﴿ألستُ بربكم﴾ی گوفتاری خواوەندی پێدایەوە. خۆ هەر مرۆڤێك بە وردی سەرنج لە خۆی بدات، هەست بەو زایەڵەیە دەکات کە لە قووڵایی‌یەکانی ناخی ڕۆحی خۆیەوە بەرز دەبێتەوە. دەنا گەر لە "ژیری" یان "جەستە"دا بە دوای ئەم زایەڵەیەدا بگەڕێت، ئەوا گرفتاری هەڵوێستە دژ بە یەك و نادروستەکان دەبێت. بەڵێ ڕاستە، ئەم زایەڵەیە لە ویجدانی هەموو کەسێکدا هەیە، بەڵام چەسپاندنەکەشی تایبەتە بە مەیدان و بواری خۆیەوە.

جا هەموو ئەهلی تەحقیق و ئەهلی شهوود و ئەصفیا و ئەولیا و پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - بە وێنەی خۆری ڕۆژی ڕووناك ئەمەیان دیوە و پیشانی غەیری خۆیشیانداوە. بەڵام لە ڕێی ژیری‌یەوە ناتوانین بیچەسپێنین و ڕوونی بکەینەوە وەك ئەوەی کە درەختێکی پەڵك یان سنەوبەر ڕوون دەکەینەوە. ئەو کەسەی گوێ لە ویجدانی خۆی ڕادەگرێت و چاوی بەو شتانە دەکەوێت کە لەوێ ڕوو دەدات، بە بێ گومانی ئەمە دەبینێت و هەستی پێ دەکات و دەیبیستێت.

* * *

**پرسیاری سێ‌هەم**

**قورئانی پیرۆز ڕوونی کردووەتەوە کە ویستی هەمەکی (ئیرادەی کوللی) تایبەتە بە خوای گەورەوە. خۆ ئاشکرایشە کە مرۆڤ ویستێکی جوزئیی هەیە. ئایا ئەو کەسەی گوناه دەکات، لەسەر بناغەی ویستە جوزئی‌یەکەی خۆی دەیکات.. یان ئیرادەی کوللیی خوای گەورە پاڵی پێوە دەنێت بۆ گوناه‌کردن؟**

وەڵام: ئەم مەسەلەیە بەم چەشنەی خوارەوە کورت دەکەینەوە:

مرۆڤ ویستێکی هەیە و ئێمەش ناوی: "ئیرادەی جوزئی" یان "ویستی بەشەری" یاخود "توانای کەسبی مرۆڤ"مان لێ ناوە. بە بەدیهێنانەکەی خوای گەورەش دەڵێین: "ئیرادەی کوللی" یان "هێزی بەدیهێنان" یان "قودرەت" یان "ئیرادە" یان "تەکوین" (کە هەموو ئەمانەش سیفاتی خوای گەورەن).

جا ئەگەر مەسەلەکە لەو ڕووەوە بگرین کە دەگەڕێتەوە بۆ خوای گەورە، مرۆڤ وا تێدەگات کە وەك بڵێی خوای گەورە شتان ناچار دەکات بۆ پەیدا بوون و هاتنە وجوود. ئیتر بەم جۆرە "جەبر" خۆی دەهاوێتە ناو مەسەلەکەوە. خۆ ئەگەر لەو ڕووەشەوە ئەم مەسەلەیە بگرین کە دەگەڕێتەوە بۆ مرۆڤ ئەوا وای لێ تێدەگەین کە مرۆڤ خۆی بکەری کردەوەکانی بێت. ئەو کاتەش بیری "قەدەرییە - موعتەزیلە" خۆی دەکات بە ناودا کە لەسەر ئەو بناغەیە دامەزراوە گوایا: "بەندە بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆیەتی"!

لە ڕاستیدا خوای گەورە بەدیهێنەری هەموو شتێکە لە بوونەوەردا. ئەو ئیرادە کوللی‌یەی کە لە پرسیارەکەدا هاتووە بریتی‌یە لەمە. تەنانەت ئایەتی پیرۆزی: ﴿والله خلقكم وما تعملون﴾(الصافات:٩٦) ڕوونی دەکاتەوە کە خوای گەورە بەدیهێنەری خۆتان و ئەو کردەوانەشتانە کە ئەنجامیان دەدەن. بۆ نموونە: گەر ئۆتۆمبیلێك دروست بکەن یان خانووبەرەیەك بنیات‌بنێن، ئەوا خوای گەورە بەدیهێنەری هەموو ئەو شتانەیە و چ خۆتان و چ کردەوەکانتان هەموو هی خوای گەورەن. بەڵام تەنها یەك شت تایبەتە بە ئێوەوە، ئەویش کەسب و کارتێداکردنی مرۆڤە، کە مەرجێکی عادی‌یە و وەکو "مەیل" یاخود بە وێنەی دەست‌لێوەدانی سویچی تۆڕێکی کارەبایە کە دنیا ڕووناك دەکاتەوە. جا هەروەك لەم هەڵوێستەدا ناتوانرێت بوترێ: هیچ دەستێکی ئێوە لەم کارەدا نی‌یە، ناشتوانرێت هەموو شتێکی ئەم کارە هی ئێوە بێت. کارەکە بە تەواوی هی خوای گەورەیە، بەڵام کاتێ خوای گەورە ئەم شتانە بەدی‌دەهێنێت دەست‌تێوەردانی جوزئیی ئێوەی وەك مەرجێکی عادی قبووڵ کردووە و هەموو ئەو شتانەی کە خۆی دەیانکات و بەدی‌یان‌دەهێنێت لەسەر ئەو جوزئە ئیختیاری‌یە بنیاتی‌ناون.

بۆ نموونە: سیستەمی کارەبای ئەم مزگەوتە، خوای گەورە بەدیی‌هێناوە و، داگیرساندنەوەی سەرلەنوێیشی هەر تایبەتە بە خواوەندەوە. چونکە بەدیهێنانی ڕووناکی لە لافاوی ئەلیکترۆنەکان و ڕووناك کردنەوەی مزگەوتەکە هەریەکەیان

کارێکی سەربەخۆیە لە خۆیدا و هەموو ئەم کارانەش ئەو خوایە ئەنجامیان دەدات کە: "نورالنور، منورالنور، مصورالنور"ە، بەڵام بەشی دەستتێوەردان و کاری ڕاستەوخۆی ئێوە لە ڕووناککردنەوەی ئەم مزگەوتەدا ئەو سیستەمەیە کە خوای گەورە لە کارەبادا دایناوە و بریتییە لەوەی تەنها پەنجە لە سویچی کارەباکە بدەن ئیتر مزگەوتەکە ڕووناك ببێتەوە. بەڵام کاری ڕووناککردنەوەی مزگەوتەکە بە سیستەمی کارەبا، تایبەتە بە خوای گەورەوە و گەلێ لە وزە و ویستی ئێوە بەرز و باڵاترە.

با ئەمە زیاتر ڕوون بکەینەوە. بۆ نموونە: مەکینەیەکی ئامادە بۆ کارکردن و ڕۆیشتن، کە تەنها ئەرکی پەنجەلێدانی کلیلی خستنەکاری بە ئێوە درابێت. جووڵاندنی ئەم مەکینەیە تایبەتە بەو کەسەوە کە دروستی کردووە، بۆیە بەم دەستلێدانە جوزئییەی کە تایبەتە بە مرۆڤەوە دەڵێین: "کەسب" (واتە بەدەستهێنان) یان "ئیرادەی جوزئی". بەڵام ئەوەی کە تایبەتە بە خوای گەورەوە پێی دەڵێین: "خەلق، ئیجاد" (واتە بەدیهێنان). بەم پێیە ئیرادە(ویست) دەبێت بە دوو بەشەوە:

١ ـ ئیرادەی کوللی.

٢ ـ ئیرادەی جوزئی.

ویست و ئیرادە تایبەتن تەنها بە خوای گەورەوە: ﴿**وما تشَاؤُونَ إلاّ أن يشَاءَ الله**﴾(الإنسان: ٣٠). بەڵام بۆ ئەوەی کەس بە هەڵە تێ نەگات ئەوا کاتێ کە ئەم قسەیە دەکەین لەگەڵیدا دەڵێین: بەندەش ئەرکی پەنجەلێدانی سویچەکەی لەم کارەدا بەرکەوتووە، کەواتە ئەویش ئیرادەی هەیە، ئەمەش بۆ ئەوەی نەکەوینە ئەو بۆچوونە دژ بە یەکانەی کە ڕێڕەوی "جەبری" تێی کەوت. کاتێکیش کە دەڵێین: بەدیهێنەری ئەو شتە هەر تەنها خوای گەورەیە، دەمانەوێت ڕوونی بکەینەوە کە ئێمە وەکو ڕێڕەوی "موعتەزیلە" ناڕوانینە مەسەلەکان. بەمەش کارێك دەکەین کە شیرك و هاوبەشایەتی بۆ خوای گەورە دانەنێین، نە لە خوایەتییەکەیدا نە لە پەروەردگارێتییەکەیدا. چونکە خوای گەورە هەروەك لە زاتیدا تاك و تەنیایە، لە بەڕێکردنی کارەکانیشیدا بە هەمان جۆر تاك و تەنیایە و کاری خۆی بە کەسی تر ناسپێرێت و هەر بە زاتی خۆی هەموو شتێك بەدیدەهێنێت. بەڵام لەبەر "تەکلیف" و حیکمەت و نهێنییەکانی تری هاوچەشنی، دەستتێوەدانی مرۆڤی لەو کارانەدا وەك مەرجێکی عادی قبووڵ کردووە.

بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر لێرەدا نموونەیەك دەهێنین کە پێشەوایەکی مەزن باسی کردووە:

(ئەگەر منالێکی کۆلەواری لاوازت لەسەر شانت هەلگرت و سەربەستیت دایە دەست خۆی و پێت وت: چ جێگایەکت دەوێت دەتبەم بۆ ئەوێ، منالەکەش داوای کرد بۆ سەر چیایەکی مەزن سەری بخەیت و تۆش بردت بۆ ئەوێ، بەڵام منالەکە لەوێ نەخۆش کەوت یان کەوتە خوارەوە. بێ گومان پێی دەڵێیت: تۆ خۆت داوای ئەمەت کرد. ئیتر سەرزەنشتی دەکەیت و، جگە لە ئازارەکەی خۆی، ئازاری زللەی تەمێ کردنیشی بۆ زیاد دەکەیت! خوای گەورەش - ولله المثل الأعلى - بە هەمان جۆرە، ئەوەتا ئەو خواوەندەی کە "أحکم الحاکمین"ە، "ویست"ی ئەم بەندەیەی خۆی، کە لەوپەڕی لاوازیدایە، کردووە بە مەرجێکی ئاسایی بۆ ویستە هەمەکییەکەی خۆی)[1].

ئایا لەم نموونەیەدا دەتوانرێ ئینکاریی "ویست"ی منالەکە بکرێت؟ بێ گومان لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، چونکە خۆی ویستوویەتی و داوای کردووە. بەڵام ئەو کەسەی گەیاندییە ئەو شوێنە بەرزە، تۆ بوویت گەیاندت. بە هەمان جۆر نەخۆشییەکەش منالەکە نەیکردووە و ئەنجامی نەداوە، بەڵکو جگە لە داواکردنی ڕۆشتنی سەر چیاکە هیچ شتێکی تری لێ دەرنەکەوتووە. کەواتە دەبێ ئەمانە لە یەك جیا بکرێنەوە: ئەو کەسەی منالەکەی نەخۆش خست و.. ئەو کەسەی گەیاندییە ئەوێ و.. ئەو کەسەش داوای ئەم گەیاندنەی کرد. ئێمە لەم واتا و تێگەیشتنەوە دەڕوانینە: "قەدەری خوا" و "ویستی مرۆڤ". خۆ جگە لە خوای گەورەی خاوەن تەقدیر کەسی تر حەقیقەتی هیچ شتێك نازانێت.

* * *

### پرسیاری چوارەم

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿مَن يَهدِ الله فهُو المهتَدِ ومَن يُضلِل فلن تجدَ له وليا مُرشِداً﴾(الكهف:١٧).

هەروەها لە قورئاندا هەیە کە: خوای گەورە بیر و ژیری و ویستی بە مرۆڤ داوە و، هەردوو ڕێگاکەی پیشان داوە و سەربەستە لە گرتنەبەری هەر کامیاندا. ئایا چۆن ئەم دوو شتە یەك بخەین؟

**وەڵام:** ئەم پرسیارە دوو کەرتی تێدایە:

---

(١) بڕوانە: سەرجەمی پەیامەکانی نوور، بەرگی یەکەم (وتەکان) نووسینی بدیع الزمان مامۆستا سەعیدی نوورسی ل ٦٦٠ کە بە پشتیوانیی خوای گەورە کردمان بە کوردی. (وەرگێڕ).

ئایا ئەو شتەی ڕوو دەدات بەو ئیرادە کوللی‌یە ڕوو دەدات کە خوای گەورە ویستی لەسەریەتی، یان مرۆڤ ویستی خۆی تێدا دەخاتە کار؟ واتای ئەو هیدایەتەی کە لە پرسیارەکەدایە بریتی‌یە لە: ڕێی ڕاست.. ڕوشد.. ئەو ڕێگایەی کە پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - گرتیانەبەر. بەڵام ضەلالەت(گومڕایی) بریتی‌یە لە: ڕێی گومڕایان.. ونبوون لە ڕێی ڕاست.. لادان لە ڕاستەشەقام.

جا ئەگەر بە وردی سەرنج بدرێت دەزانرێت کە هەردوو شتەکە یەك کارن و ئەو ڕووەشی کە پەیوەندیی بە مرۆڤەوە هەیە بریتی‌یە لە کارێکی یەکجار بچووك. جا لەسەر ئەم بناغەیە، دەبێ هەردوو کارەکە بدرێتە پاڵ خوای گەورە، چونکە هەرچی کارە دەگەڕێتەوە بۆ خوا و هیچ کارێك نی‌یە هی ئەو نەبێت. لەبەر ئەوە، خوای گەورە بە داخوازیی ناوی: "المضل"ی خۆی "ضەلالەت" بەدی‌دەهێنێت و، بە داخوازیی ناوی: "الهادي"شی "هیدایەت" بەدی‌دەهێنێت. کەواتە ئەو کەسەی هیدایەت دەدات و گومڕاش دەکات هەر تەنها خوای گەورەیە.

بەڵام ئەمە وا ناگەیەنێت کە بەندە لە لایەن خوای گەورەوە بە زۆرەملێ بەرەو "گومڕایی" و "هیدایەت" ڕاپێچ دەکرێت، بێ ئەوەی خۆی هیچ دەستێکی تێدا هەبێت!

دەکرێ بە کورتی و بەم شێوەیەی خوارەوە لەم مەسەلەیە تێ‌بگەین:

گەر گرتنەبەری ڕێی "هیدایەت".. یان بەربوونەوە بەرەو "ضەلالەت" کارێك بێت قورسایی‌یەکەی - بۆ نموونە - دە تەن(طــن) بێت، ئەوا کارێکی هەڵەیە گەر یەك لە سەدی ئەو قورسایی‌یە بە مرۆڤ بدرێت! چونکە خاوەنی ڕاستەقینەی ئەو کارە هەر تەنها خوای گەورەیە، کەواتە دەبێ کارەکە بدرێت بە خاوەنەکەی.

با ئەمە زیاتر ڕوون بکەینەوە:

خوای گەورە هیدایەت‌دەرە و گەلێ هۆکاری هیدایەتیشی بۆ مرۆڤ داناوە. بۆ نموونە: هاتن بۆ مزگەوت و.. گوێ‌گرتن لە ئامۆژگاری و.. ڕووناك‌کردنەوەی بیر و.. گوێ‌ڕاگرتن لە قورئانی پیرۆز و.. بیرکردنەوە و ڕۆچوون لە ناخی واتاکانی‌دا و.. ئامادەبوونی کۆڕی پێغەمبەر ﷺ و.. قوتابێتی کردن بە گوێی دڵ بۆ فەرموودەکانی و.. گوێ لێ ڕاگرتنیان بە گوێی ڕۆح و دڵێکی بێدار و.. خاوێن‌کردنەوەی ویجدان بە وێنەی ئاوێنە بۆ دانەوەی ئەو درەوشانەوانەی کە بۆی دێن.. هەموو ئەمانە، هەندێکن لە ڕێگاکانی هیدایەت و، مرۆڤ خۆی بۆ خۆی لەم ڕێگایانەدا مامەڵە لەگەڵ هیدایەت‌دا دەکات. بەڵێ ڕاستە، هاتن بۆ مزگەوت مامەڵەیەکی جوزئی‌یە، بەڵام خوای گەورە ئەم هاتنە - ئەم مامەڵە جوزئی‌یە - دەکات بە هۆکاری هیدایەتدان. کەواتە هیدایەت‌دەر

هەر خوای گەورەیە، بەڵام لە دەرگادەری خوای گەورە بۆ گەیشتن بەم هیدایەتە: بەندەکەیەتی، کە ئەم کارەی ناوی "کەسب"ی لێ نراوە.

هەروەها مرۆڤ بە سەردانی لە مەیخانەکان و.. شوێنەکانی هەرزەیی و.. بتخانەکان، لە دەرگای ناوی: "المضل" دەدات و، وەك ئەوە وایە بڵێت: گومرام بکە! خوای گەورەش گەر بیەوێت گومڕای دەکات و گەر بیشیەوێت چەندین تەگەرەی دەهێنێتە ڕێ تاکو گومڕای نەکات.

کەواتە گەر بە وردی سەیری ویستی جوزئیی مرۆڤ بکەین، دەبینین هێندە کەم و بچووکە کە ناتوانێت هیدایەت و گومڕایی بەدیبهێنێت.

ئایا نموونەتان لەسەر ئەمە دەوێت؟ دەفەرموون بڕوانن:

کاتێ گوێ لە قورئانی پیرۆز و ئامۆژگاری و ڕێنمایی دەگرن، یان کتێبێکی زانستی دەخوێننەوە، ناوەوەتان نوقمی نوور و ڕووناکی دەبێت.. کەچی یەکێکی تر هەر تەنها بە بیستنی بانگی محمدی.. یان ئامۆژگاری.. یان نەرم و نیانترین موناجاتی قەلبی.. هێندە بێزار دەبێت کە سکاڵا لە دەنگی بانگ دەکات!

بەو واتایەی کە "هیدایەت" و "گومڕایی" هەردووکیان بە دەستی خوای گەورەن، بەڵام گەر هەر مرۆڤێك پێی نایە سەر ڕێی گومڕایی - بە وێنەی دەستدان لە سویچی کارەباکە - ئەوا خوای گەورەش بەشە کارە تایبەتییەکەی خۆی کەبریتییە لە ٩٩٩,٩ بەدیدەهێنێت و، ئنجا وای لێ دەکات کە مەیلی بە لای گومڕاییدا بێت. جا لەسەر ئەم ئارەزووەی بەندەکەی یان سزای دەدات یان لێی خۆش دەبێت.

* * *

### پرسیاری پێنجەم

کەسانێکی زۆر دەبینین کە خوای گەورە سامانی زۆر و ئۆتۆمبیلی ڕەنگین و کۆشك و تەلاری گەورە و شان و شەرەفی بەرز و ناوبانگی بڵاوی پێ بەخشیون، کەچی کەسانێکی تر هەن بەدەست برسێتییەوە دەتلێنەوە و گرفتاری ئازار و گیروگرفت و هەژاری و نەخۆشییەکان دەبن. ئایا ئەمانە کەسانێکی بێ کەڵکن و، ئەوانی تریش خواوەند خۆشی دەون کە ئەم هەموو نیعمەتەی بەسەردا باراندوون، لە کاتێکدا کە ئەمان لە ژێر ئەرکە قورسەکانی ژیاندا دەپلیشێنەوە؟!

وەڵام: ئەم جۆرە پرسیارە نابێ بکرێت، مەگەر تەنها بۆ مەبەستی تێگەیشتن و فێربوون، دەنا مرۆڤ - پەنا بەخوا - دەکەوێتە ناو گوناهەوە. لە ڕاستیدا ئەو کەسەی کە بەم چەشنە بیرکردنەوەیەوە گیرۆدە بووە ئەم جۆرە پرسیارەی پێویستە.

بەڵێ، خوای گەورە كۆشك و ئۆتۆمبیل و ئەسپ و مەڕ و ماڵات و زەوی و زار بەو کەسانە دەدات کە خۆی ویستی وایە بیانداتێ، هەروەك هەژاری و موحتاجیش بەوانە دەدات کە خۆی دەیەوێت بیانداتێ. بەڵام دەبێ لە هەموو ئەمانەدا ئینکاریی ڕۆڵی هۆکارەکانی خێزان و ژینگەی دەوروبەری ئەو کەسە نەکرێت. بۆ نموونە: ناتوانرێت ئینکاریی شارەزایی کەسێك بکرێت لە بەدەستهێنانی ساماندا، هەروەك ناشکرێت ئینکاریی ئەوە بکرێت کە ئەو زانینەی سەبارەت بە ڕێگاکانی بەدەستهێنانی سامانەوە هەیەتی، بەپێی بارودۆخی دەوروبەری، هۆکارێك بن بۆ ئەو بەدەستهێنانەی. جگە لەمەش خوای گەورە لەو کاتەدا کە ئەهلییەتی هەندێ کەسی دەرخستووە کەچی منداڵ و سامانی نەداوەتێ. لەگەڵ ئەمەشدا لە حەدیسێکی ضەعیفی پڕ واتادا ئەمە هاتووە کە تایبەتە بە باسەکەی خۆمانەوە:

(إنَّ اللهَ يعطي المال مَنْ يُحِبُّ ومن لا يحب، ولا يُؤتي الإيمانَ إلاّ من أحبَّ. فإذا أحبَّ الله عبداً أعطاه الإيمانَ)[1].

لە لایەکی تریشەوە دەبێ سامان - خۆی لە خۆیدا - بە خێر و چاکە دانەنرێت. بەڵێ، گەر خوای گەورە ویستی لەسەری بێت، هەندێ جار سامان و منداڵ بە هەندێ کەس دەدات و هەندێ جاری تریش نایداتێ و، لە هەردوو حاڵەتەکەدا خێر لە کارەکەدا هەیە، چونکە گەر تۆ مرۆڤێکی باش بیت و ئەو سامانەی کە خوای گەورە پێی بەخشیویت لە کردەوەی چاکدا بەکاریان بهێنیت، ئەوا بۆت دەبێت بە خێر. خۆ ئەگەر مرۆڤێکی خراپ و گومڕا بیت و لە ڕێی ڕاست لادابێت، ئەوا خوای گەورە چ سامانت بداتێ و چ نەتداتێ هیچیان خێر نین.

بەڵێ ڕاستە، گەر تۆ ڕێی ڕاستت نەگرتبێتە بەر ئەوا هەژارییەکەت بۆ دەبێت بە دەرگایەك و لەسەر کوفر دەخرێتە سەر پشت، چونکە بەرەو سەرپێچی کردن لە فەرمانەکانی خوا دەتداتەبەر و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ سەرپێچی و ملنەدانت بۆ خوای گەورە زیاد دەکات.. بە هەمان جۆر گەر لەسەر ڕاستەشەقام نەبیت و ژیانی قەلبی و ڕۆحیت نەبێت ئەوا دەوڵەمەندییەکەت لێ دەبێت بە بەڵا و گیروگرفت. خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿المالُ والبنون زينةُ الحياة الدنيا﴾(الكهف:٤٦).

---

(١) مجمع الزوائد: ١٠/٩٠، ٢٢٨، الديلمي. واتە: خوای گەورە ماڵ و سامان دەدات بەوانەی کە خۆشی دەوێن و بەوانەش کە خۆشی ناوێن، بەڵام ئیمان تەنها بەو کەسانە دەدات کە خۆشی دەوێن. کەواتە گەر خوای گەورە کەسێکی خۆش بوێت، ئیمانی دەداتێ.

زۆر کەس لەم تاقیکردنەوەیەدا تووشی زیان بوون.. ئەوەتا گەلێ کەس لەوانەی کە نوقمی سەروەت و سامانی زۆر و زەبەندە بوون، لەبەر ناشکوریی نیعمەت، هیچ تروسکاییەکی نوور و ڕووناکی لە دڵیاندا نییە. کەواتە سامانْدانی خوای گەورە بەو چەشنە کەسانە لە ڕاستیدا ئیستیدراجە و هۆیەکە بۆ گومڕاکردنیان. خۆیشیان شایانی ئەم ئەنجامەن، چونکە بە دەستی خۆیان ژیانی قەلبی و ڕۆحیی خۆیانیان مراندووە و ئەو توانا و قابیلییاتانەشیان تێکداوە کە خوای گەورە پێی بەخشیبوون.

لەوانەیە ئەم فەرموودە پیرۆزەی خوارەوە زیاتر ئەم مەسەلەیە ڕوون بکاتەوە:

(كَمْ مِنْ أشـعَثَ أغبَرَ ذي طمرينِ - صاحبِ ثوبين - لا يُؤبَهُ لهُ، لو أقسمَ علـى الله لأبَرَّه، منهُمْ البرَاءُ بنُ مالِكٍ)[1]!

واتە: گەلێ کەسی تەپوتۆزاوی و قژ ئاڵۆزکاو هەن کە تەنها دەستێك بەرگ و پۆشاکی دڕاویان هەیە و کەسیش بایەخیان پێ نادات، کەچی لای خوای گەورە ئەوەندە خاوەن پلە و پایەن کە ئەگەر سوێند لە خوا بخۆن بۆ هەر کارێك، خوای گەورە سوێندەکەیان ناخات و داواکەیان بۆ جێبەجێ دەکات. یەکێك لەوانە: "بەڕائی کوڕی مالیك"ە! لە کاتێکدا کە "بەڕائی کوڕی مالیك"ی برای ئەنەس، نە خواردنی هەبوو بیخوات و، نە خانە و لانەشی هەبوو بڕواتە ناوی. بەڵکو هەر بە هێندە دەژیا کە لە برساندا نەمرێت!

لەوانەیە زۆر کەس هەبن بە وێنەی "بەڕاء" تەپوتۆزاوی و قژ ئاڵۆزکاو بن، بەڵام خوای گەورە کە سەیری دڵە مەزن و ڕۆحە فراوانەکانی کردوون ئەم پلەیەی داونەتێ و وەك لەسەر زمانی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە: "لو أقسمَ على الله لأبَرَّهُ"!

کەواتە نە "دەوڵەمەندی" بە تەنها خۆی و نە "هەژاری"ش بە تەنها خۆی، بە موسیبەت دانانرێت، بەڵکو هەریەکەیان بەپێی ڕێ وشوێنەکەی حسابی بۆ دەکرێت، هەژاری لە هەندێ شوێندا و دەوڵەمەندییش لە هەندێ شوێندا، بە نیعمەتی خوای گەورە دادەنرێن.

پێغەمبەر ﷺ بە ویستی خۆی "هەژاری"ی هەڵبژاردووە و، فەرموویەتی: (ئایا ڕازی نابیت بەوەی کە دنیا بۆ ئەوان بێت و ئەودنیاش بۆ ئێمە)؟[2]. حەزرەتی عومەریش - خوای لێ ڕازی بێت - تەنها ژیانی مایەی بژێو (کفاف)ی بۆ خۆی هەڵبژارد و هیچ لەم ئەندازەیە زیاتری نەویست، تەنانەت لەو کاتەشدا کە گەنجینەکانی دنیای هێنرانە بەردەست!

---

(١) رواه الترمذي: المناقب ٥٥.

(٢) رواه البخاري و مسلم.

بەڵام جۆرە هەژارییەك هەیە کە - خوا پەنامان بدات - وەختە لەگەڵ کافریدا یەکێك بێت.. بۆ نموونە گەر ئەو چەشنە پرسیارە کەسێکی ئیماندار نەیکات، بەڵکو هی کەسێك بێت کە کافر و ناشکور بێت بە نیعمەتەکان، ئەوا ئەو کەسەی کە بەو جۆرە سکاڵا لە نیعمەتەکانی خوا دەکات، بە کافر دادەنرێت!

بەو واتایەی کە "هەژاری" لە شوێنی خۆیدا نیعمەتە و.. "دەوڵەمەندی"ش لە شوێنی خۆیدا نیعمەتە. بناغەی مەسەلەکەش بریتییە لە بوونی تەصدیق لەناو دڵدا.

دەسا ئەی پەروەردگارم! هەرچی لە تۆوە بێت هەمووی هەر جوانە و پێم خۆشە: خەڵات بێت یان کفن.. چ گوڵێکی پشکوتوو بێت یاخود درِكودالْ. چونکە لوتف و قەهرت هەردووکیان جوان و ڕەنگینن.

خەڵکی خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ(کوردستان) هەمیشە ئەم گوفتارە دەڵێنەوە:

(خوایە! هەرچی لە لایەن تۆوە بێت جوانە)[1]!

بەڵێ، گەر مرۆڤ لەناو دەریای سامان و دەوڵەمەندیدا بێت و لەگەڵ خوای گەورەدا بێت، ئەوا بە وێنەی شێخی گەیلانی - قدس سره - پێی لەسەر شانی ئەولیاکان و پێی پێغەمبەریش ﷺ لەسەر شانی ئەو دەبێت. بەڵام گەر هیچ شتێکی لەگەڵ خوادا نەبێت ئەوا مرۆڤی هەژار دنیا و ئاخیرەتی لەدەست چووە و، دەوڵەمەندیش ئەنجامەکەی هەر زیان و زەرەرمەندی دەبێت هەرچەندەش لە ڕواڵەتدا لەناو بەختەوەری و ناز و نیعمەتدا بێت.

* * *

**پرسیاری شەشەم**

بۆچی خوای گەورە بەندەکانی خۆی "یەکسان" دروست نەکردووە؟ ئەوەتا هەندێکیان کوێر و هەندێکیان شەلن؟

**وەڵام:**

١ - خوای گەورە خاوەنی موڵکی دنیا و قیامەتە و بە ویستی خۆی ئاڵوگۆڕ بەسەر موڵکەکانیدا دەهێنێت و هەڵسوکەوتیان تێدا دەکات و، هەرگیز هیچ کەسێك خۆی لە کاروبارەکانیدا هەڵناقورتێنێت. ئەو کەسەی کە گەردیلەکانی جەستەی تۆی بەدیهێناوە و بەشەکانی ئەو جەستەیەشی ڕێكخستووە: خوای گەورەیە.. ئەو کەسەی تۆی بە مرۆڤ بەدیهێناوە: هەر خوای گەورەیە. تۆ لە پێش هەموو ئەمانەدا هیچ شتێکت بە خوای گەورە نەداوە هەتا ئیددیعای ماف بکەیت بەسەریەوە. چونکە گەر لە

(١) لای خۆمان دەڵێن: (هەرچی لە لایەن خواوە بێت خۆشە)!

پێشەکی‌دا شتێکت بە خوای گەورە بدایە لەوانەیە مافی ئەوەت ببوایە کە بت‌وتایە: دوو چاوم بدەرێ نەك یەکێك، دوو دەستم بدەرێ نەك یەك دەست.. خۆ تۆ هیچ شتێکت بەو نەداوە تا - پەنا بەخوا - ستەمی بدەیتە پاڵ. چونکە ستەم لە ناحەقی و ماف‌نەدانەوە سەرچاوە دەگرێت. ئایا تۆ چ مافێکت بەسەر خوای گەورەوە هەیە پێی نەدابیت تاکو ئیددیعای ستەمی لەسەر بکەیت؟ خوای گەورە تۆی لە "نەبوون"ەوە هێناوەتە "بوون" و ئنجا کردوویتی بە مرۆڤ. خۆ ئەگەر کەمێك سەرنج لەو بوونەوەرانە بدەیت کە زۆر لە خوارووی تۆوەن، دەزانیت نیعمەتی زۆرت دەست‌کەوتووە.

٢ - هەندێ جار خوای گەورە تەنها یەك پێ لە مرۆڤێك دەسێنێتەوە، بەڵام لە دوارۆژدا گەلێ شتی دەداتێ، چونکە بەم لێ‌سەندنەوەیەی ئەو بەشە والەو مرۆڤە دەکات کە هەست بە: دەستەوسانی و لاوازی و هەژاریی خۆی بکات و، لەم ڕێیەوە خوای گەورە دڵی ئەو بەندەیەی بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت. خۆ ئەگەر خوای گەورە دڵی ئەم مرۆڤە بکاتەوە و شادمانی و چاوکراوەیی پێ ببەخشێت ئەوا زۆری پێ بەخشیوە و کەمیشی لێ وەرگرتووەتەوە! لە ڕاستی‌دا ئەمە لوتفی خوای گەورە دەگەیەنێت بەو بەندەیەی، هەرچەندەش لە ڕواڵەت‌دا ئەو لوتفە دەرناکەوێت، وەك ئەوەی کە "پلەی شەهیدی" بە یەکێك ببەخشێت و بیخاتە بەهەشتەوە و بە حوزووری خوای گەورە شاد و بەهرەمەندی بکات. کە ئەمەش پلەیەکە صیددیقان و پیاوچاکان خۆزگەی پێ دەخوازن، تەنانەت هەر کەسێك دەیبینێت دەڵێت: خۆزگا ئێمەش وەك ئەو بە پلەی شەهیدی شەرەفمەند دەبووین. کەواتە ئەم مرۆڤەی کە شەهیدیی خەڵات کراوە، گەر پارچە پارچەش بکرێت هێشتا هەر کەمی بەخشیوە. چونکە ئەوەی دەستی کەوتووە گەلێ زیاترە لەوەی بەخشیویەتی!

بە دەگمەن ڕوو دەدات کە هەندێ کەس لەوانەی هەندێ ئەندامی جەستەیان لەدەست داوە، لە ڕێ بترازێن و هەست بە ناتەواوی بکەن و ڕەخنە و بەهانە لە کاری خوای گەورە بگرن و بێزاری و ڕەش‌بینی‌یان تێدا بێت. چونکە زۆربەی ئەو کەسانە ناتەواوی‌یەکانیان بۆ بووە بە هۆکارێك کە ڕوویان پێ بکاتە خوای گەورە. لەبەر ئەوە، نابێ ئەو چەند کەسە کەمانە بە نموونە بهێنرێنەوە کە وەك مێرووی زیانبەخش وان و هەندێ ئەندامی جەستەیان لەدەست داوە. بەڵکو دەبێ بزانرێت کە بناغە و ئەسڵی ئەم مەسەلەیە بریتی‌یە لە بێدارکردنەوەی گیانی شەوق و تاسەمەندی بۆ ئاخیرەت لە دڵ و دەروونی خەڵکی‌دا، کە هەر لە بناغەدا بۆ ئاخیرەت بەدی‌هێنراون.

واتە ئەم چەشنە شتانەی کە دێنە ڕێی مرۆڤ، خاوەنەکەیان بۆ لای خواوەند دەگێڕنەوە و، هەندێ کەسی تریش پەندی لێ وەردەگرن و متمانە و دڵنیایی پێ پەیدا

دەکەن بە خوای گەورە. خۆ دیارە بەمەش ئەو ئامانجە حەکیمەی کە لەم چەشنە حاڵەتانەدایە، دێتەدی.

هەموو لەدایكبووان و کۆچ کردووانی ئەم جیهانە بابەتی تاقیکردنەوە و ئیمتیحانن. چونکە هەروەك "بوون"ی هەر شتێك بەڵگەیە لەسەر بەدیهێنەرێك کە لە پشت پەردەوەیە، بە هەمان جۆر "مردن" و کۆتایی پێهاتنی ئەرکی سەرشانیشی بەڵگەیە لەسەر ئەبەدییەتی ئەو بەدیهێنەرەی پشت پەردەکە، کە سەرەتا و کۆتایی بۆ نییە.. ئنجا هەروەك ئێمە و سەرجەمی بوونەوەران لە عەدەم و هیچەوە هاتووینەتە وجوود و بە "بوون"ی خۆمان دەبین بە بەڵگە لەسەر بوونی بەدیهێنەر و بە "بیستن" و "بینین" و "زانست"یشمان دەبین بە بەڵگە لەسەر زاتێکی تەنیای بینەر و بیسەر و زانای ڕەها.. بە هەمان جۆر، بە وازهێنان و دەستهەڵگرتنیشمان لە ئەمانەتی ئەستۆی درێژایی ژیانمان، دەبین بە بەڵگە لەسەر خواوەندی "تاك وتەنیا":

﴿الذي خَلق الموتَ والحياةَ ليبلوكُم أيّكم أحسنُ عَملاً﴾(الملك:٢).

گرنگترین شت سەبارەت بە مرۆڤەوە: پەیبردنیەتی بە نهێنیی هاتنەدنیا و، بڕینی تاقیکردنەوەی وجوود و، خۆ ئامادەکردن بۆ ماڵئاوایی.

ئێستاش دوای ئەم سەرەتایە، لەم بابەتە دەدوێین کە: ئایا ئەو کەسانەی پێکەوە کۆچی دوایی دەکەن، ئەجەلیان پێکەوە هاتووە؟

بەڵێ، ئەجەلی هەموویان پێکەوە هاتووە و هەرگیز هیچ ڕێگرێك لەمەدا نییە. چونکە هەروەك ئەو خواوەندەی کە جڵەوی سەرجەمی بوونەوەرانی لەدەستدایە، هەموو شتێك و هەموو خەڵکی پێکەوە و بەپێی قەدەری خۆی، هەر لە گەردیلەکانەوە تا گەلەستێرەکان، بەدیدەهێنێت.. هەر ئەو خوایەش دەتوانێت هەموویان پێکەوە بمرێنێت و، جیاوازیی شوێنەکانیان و وەسف و چۆنێتییە جۆراوجۆرەکانیان، هیچ ڕێیەك لەم کارەی نەگرن. بێ گومان هێنانەوەی نموونەیەك کە بە تەواوی توانستی ڕەهای خوای گەورە دەربخات، کارێکی یەکجار دژوارە.. بەڵام دەتوانرێت گەلێ نموونەی زۆر لەو شتانەدا بهێنرێتەوە کە دەگونجێ ببن بە ئاوێنەی ئەو توانستە و بیری مرۆڤ ڕوون بکەنەوە..

بۆ نموونە: ئەو بوونەوەرانەی کە لە وەسف و چۆنێتیدا لە یەکتر ناچن و ڕوویان لە خۆرە، ژیانی خۆیان بە ڕووکردنە خۆر دەبەنە سەر، بێ ئەوەی "خۆر" ژیانیان لێڵ بکات. ئەوەتا هەموو ئەوانە لە ژێر ڕووناکیی خۆردا جوانترین حاڵەت دەگرنە خۆیان و لە ڕەنگێکەوە بۆ ڕەنگێکی تر دەگۆڕێن و، بە هەڵهاتن و ئاوابوونی خۆریش پێ

دەگرن و گەشە دەكەن، ئنجا دەكوژێنەوە و كۆچ دەكەن.. هەمان حاڵ لەو شتانەشدا بەدیدەكرێت كە لە بەهاردا دەپیێن و لە هاویندا بلاوەدەبنەوە و زیاتر گەشە دەكەن و پاشان لە پایزدا زەرد دەبن و دەژاكێن. بەڵام هەموو یەكێك لەوانە نەخشە و "قەدەر"ی خۆی هەیە، چونكە هەموویان بەپێی ئەو ڕێ و نەخشە و پلانەی كە "زانستی ڕەها" بۆی كێشاون و، بە ئاراستە كردنی "ویستی ڕەها"ش دێنە وجوود و دەڕۆن، نەك بە هەڕەمەكی و بەپێی حەز و ئارەزووی خودی بوونەوەرەكە، بەڵكو بە ویستی خوای گەورە:

**﴿ويعلمُ ما في البرّ والبحر وما تسقط من ورقة إلاّ يعلمُها ولاحبّة في ظلمات الأرض ولا رطبٍ ولا يابسٍ إلاّ في كتاب مبين﴾**(الأنعام:٥٩).

جا ئەگەر "ژیان" و "مردن" و "گەشەكردن" و "بەروبووم"ی درەخت و گژوگیا و ناوك و تۆوەكان تا ئەم ڕادەیە بە جیددی گەرموگوڕی چاودێری بكرێت، ئایا دەگونجێت مرۆڤ پشت گوێ بخرێت كە كاملترینی بوونەوەرانە؟ بێ گومان ئەو خواوەندە خاوەن موڵكەی كە "بیستن" یان "بینین"ی هیچ شتێك ڕێی بیستن و بینینی شتی تری لێ ناگرێت، بایەخ بەم مرۆڤە دەدات كە ناوازەترین سنعەت و ئازیزترین بەدیهاتووی خۆیەتی و، هەر نیعمەتێكی بە "جۆر" و "ڕەگەز"ی بەدیهاتووانی تر بەخشیوە بە هەموو "تاك"ێكی مرۆڤیشی دەبەخشێت و، بە تایبەتی چاودێریی مرۆڤ دەكات كە پێرستی جیهانە و، چاكە و فەزڵ و بەخشایشی لە ئەندازە بەدەری خۆی پێ دەبەخشێت و، بە چەشنێكی تایبەتی دەیداتەبەر تا شەرەفمەندی حوزووری خۆی دەكات.

جا ئەم بانگێشتن و ڕاپێچ كردنە خواییە، هەندێ جار لەسەر جێ و، هەندێ جار لە مەیدانی جەنگ و، هەندێ جاری تریش بە موسیبەت و گرفت و ڕووداوێك دەبێت. تەنانەت هەندێ جار دانە دانە و هەندێ جاری تریش بە كۆمەڵ دەبێت، چونكە هیچ كام لەمانە لە گۆشەی ڕوانینی بەدیهێنەرەوە بۆ مرۆڤ هیچ كارێك ناكاتە سەر ئەنجام. خوای گەورە خاوەنی زانست و توانستی ڕەهایە و، هەناسەی هەموو زیندەوەرێك و جڵەوی هەموو مرۆڤێكی بەدەستە و، چ كاتێك بیەوێت جڵەوی بۆ شل دەكات. كەواتە كارێكی گەلێ ژیرەكی و مەنتیقییە كە بەپێی ئەو قەدەرەی لای خۆی نووسراوە گیانەكان بكێشێت، چ هی یەكێكی دیاری كراو بێت یان هی كۆمەڵێك بێت. پێم وایە پێشتر لەمە دواین و وتمان: وەك ماوەی تەسریح كردنی تیپێكی سوپایە بە فەرمانی سەركردەی گشتی، كە پێشتر ئەو ماوە و كاتە، لای سەركردە، دیاری كراو بووە.

جگە لەمەش گەلێ مەلائیکەتی زۆر هەن کە ئەرکی گیان کێشانیان لە ئەستۆدایە و، دەتوانن لە تەنها یەك کات و لەو شوێنانەدا کە دەرد و ئافاتیان تێدا بڵاوبووەتەوە، بە تەقدیر و سەرپەرشتی کردنی خاوەنە مەزنەکەیان گیانەکان بکێشن. تەنانەت لەوانەیە چەند مەلائیکەتێك هەبن کە بتوانن بەپێی ئەو کتێبەی کە لە بەردەستیاندایە: چاوپێکەوتن لەگەڵ هەموو کەسێکی مردوودا ساز بکەن و لەگەڵیاندا بدوێن.

لەم چەشنە کارەسات و موسیبەتانەدا گەر بە وردی سەرنج بدرێت، تەقدیری پێشتر و پێکەوە هاتنی ئەجەلی هەموو مردووان دەبینرێت و، لەوانەیە پێویستمان بە چەند بەرگێکی کتێب هەبێت تاکو هەموو ڕووداوە سەرسووڕهێن و نائاسایی یەکانی ئەم بوارەیان تێدا تۆمار بکەین، جگە لەوەی کە ئەوانەی تا ئێستا تۆمار کراون لە چەندین بەرگ تێپەڕ دەکەن. ئەوەتا ڕۆژ نی یە لە چاپەمەنی یەکاندا چەند ڕووداوێکی ئاوا نائاساییمان پێش چاو نەکەوێت.

بۆ نموونە: ئەو بوومەلەرزە سامناکانەی کە شارەکان هەڵدەگێڕنەوە و سەروبنیان دەکەن.. سەرباری ئەو هەوڵ و تەقەلا سەروماڕانەی کە لەو کاتانەدا دەدرێت، کەچی هێشتا ناتوانرێت چەند هەزار کەسێك ڕزگار بکرێن. دەبینیت ئا لەم کاتەدا سەدان منداڵ لەوانەی کە ناتوانن پارێزگاری لە خۆیشیان بکەن، لە ژێر زەوی وداروپەردووی خانووبەرە ڕووخاوەکاندا بە زیندوویی و بێ ئەوەی هیچ زیانێکیان پێ گەیشتبێت، دەدۆزرێنەوە! یان عەرەبانەیەکی کرێکارەکان هەتا ناو کەناڵی ئاوێك تلێر دەبێتەوە و هەموو کرێکارەکانی ناوی دەمرن، کەچی بە چەند ماوەیەکی دوور لە شوێنی ڕووداوەکەوە منداڵێك لەناو قوماتدا و بەسەر ئاوەکەوە دەدۆزرێتەوە کە هیچ ئازارێکی تووش نەبووە! بە هەمان جۆر لە کەوتنەخوارەوەی فڕۆکەشدا ڕوو دەدات کە هەرچی یەکی تێدا بووە تەنانەت فڕۆکەوانە کارامەکانی ناویشی دەسووتێن، کەچی لە دووری دووسەد مەترەوە منداڵێکی خۆشەویستی خنجیلانە دەدۆزرێتەوە کە هیچ زیان و ئازارێکی پێ نەگەیشتووە! جا ئەم ڕووداوانە و هاوچەشنەکانیان دەری دەخەن و دەیچەسپێنن کە "ژیان" و "مردن" جڵەویان بۆ بەرنەدراوە و بە هەڕەمەکی ڕوو نادەن، بەڵکو کارسازێکی بیسەر و بینەر دەیانسازێنێت و ڕێکیان دەخات!

هەموو بەدیهاتووان کە دێنە ژیان، چ لە شێوەی تاك تاکدا و چ لە شێوەی کۆمەڵدا بن، کاتێ بەپێی هاتنی ئەجەلی هەریەکەیان ئەو کار و ئەرکانە ئەنجام دەدەن کە خراوەتە ئەستۆیان و لە تۆماری بنەڕەتیی کردەوەکانیاندا تۆمار کراون و، دوای ئەنجامدانی ئەرکی فیطرەتیان و تێگەیشتن لە نهێنی و لایەنە وردەکانی فیطرەت و پەردەلادان لەسەر نهێنی یەکانی پشتی پەردەی سروشت و، دوای ئەوەی کە بوون بە ئاوێنەی

تیادەرکەوتنی ناوەکانی ئەو خواوەندەی کە هەموومانی ڕەوانەی ئێرە کردووە و، دوای تەواوبوونی تەمەنیان، هەر هەموویان چ بە تاك تاك و چ بە کۆمەڵ کۆمەڵ لە ئەرکی ژیان تەسریح دەکرێن!

"زانین"ی هێنانی بوونەوەران و پاشان دەست پێ هەڵگرتنیان لە کارەکانیان، واتە کۆتایی هێنان بە ئەرکی سەرشانیان و هێنانە پێشەوەی ئەجەلیان لە یەك کاتدا، کارێکی گەلێ ئاسانە سەبارەت بەو خوایەی کە خاوەنی زانستی ڕەهایە بە: سەرەتا هەتا کۆتایی هەموو شتێك. ئەمە جگە لەوەی کە دەزانین خواوەندی زانای ئاشکرا و پەنهان ژمارەیەك مەلائیکەتی گەلێ زۆری لە دەوری مرۆڤ داناوە و ژمارەیەك مەلائیکەتی زۆریشی بۆ گیان کێشان ئامادە کردووە.

لەوانەیە بەم شێوەیەی خوارەوە ئیعتیرازێك لەم باسە بگیرێت:

لەم چەشنە موسیبەتانەدا گەلێ کەسی بێ تاوان لەگەڵ ئەوانەدا تیادەچن کە شایستەی ئەو بەڵایەن. ئایا ئەم کارەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە؟

لە پێشەکیدا دەڵێین: هەڵەیەك لە عەقیدە و بۆچوونی ئەو کەسەدا هەیە کە ئەم پرسیارە دەکات و، پرسیارەکەشی لەو هەڵەیەوە سەرچاوە دەگرێت! چونکە ئەگەر "ژیان" هەر تەنها ئەم ژیانەی دنیا بوایە و ژیانی ئەودنیا وجوودی نەبوایە، لەوانەیە ئەم ئیعتیرازە تا ڕادەیەك جێی خۆی بوایە. کەچی لە ڕاستیدا ئەم دنیایە تەنها بریتییە لە کێڵگە و، مەیدانی کار و، هۆڵی چاوەڕوانی. بەڵام ئەودنیا خەرمان و شوێنی دروێنەی داهات و هاتنەبەری بەروبووم و گەیشتن بە بەختەوەری و ڕزگاربوونە لەو شتانەی کە لەم دنیایەدا مرۆڤ بێزار دەکەن.

لەبەر ئەوە، هەرگیز پێکەوەمردنی "باش" و "خراپ" و "بێ تاوان" و "تاوانبار" کارێکی نامۆ نییە، بەڵکو ڕوودانی ئەم کارە بەم جۆرە مردنە زیاتر لەگەڵ مەنتیق و ژیریدا یەك دەگرێتەوە، چونکە هەموو مرۆڤێك کە لەودنیادا زیندوو دەبێتەوە، بەپێی نیەت و ڕەفتار و کردارەکانی ئێرەی وجوودێکی نوێی دەدرێتێ و هەر بەو پێیەش مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت: یان ژیانی بەختەوەرییەکی هەمیشەیی.. یان بەدبەختییەکی بەردەوام.

**پوختەی قسە:**

"مردن" و "ئەجەل" بریتین لە: کۆتایی هاتنی ماوەی مانەوە و کارکردن لەم دنیایەدا. جا ئەم چەشنە ماوەیە بریتییە لەو نەخشەیەی کە پێشتر خواوەندی بیسەری زانا کێشاویەتی و لە تۆمارە بنەڕەتییەکاندا تۆمار کراون و، هەر بە فەرمانی خواوەند

خۆیشی لە کاتی دیاری کراودا جێبەجێ دەکرێن و، لە ڕووی مەنتیق و ژیریشەوە هیچ جیاوازی‌یەك لەوەدا نی‌یە کە ئەم کارە بە "دانە دانە" یان لە شێوەی "کۆمەڵ"دا جێبەجێ بکرێت.

من لەو باوەڕەدام کە هۆکاری یەکەمی لەڕێترازانی مرۆڤ لەم مەسەلەیە و گەلێ مەسەلەی تردا، دەگەڕێتەوە بۆ: جەهل و تێنەگەیشتن لە "زانستی ڕەها"ی خوای گەورە و "توانستی بێسنوور"ی. هەروەك هۆکارێکی تر: هەڵەکردنی مرۆڤە لەو گۆشەی ڕوانینەی کە لێیەوە دەڕوانێتە شتان و ڕووداوەکان. چونکە ئەگەر نەتوانین خۆمان لە چەمکەکانی: "سروشت" و "ڕێکەوت" دامالین و لە ناخمانەوە بەسەر "ملنەدان" و "ئینکاری کردن"دا زاڵ نەبین، ئەوا ناوەوەمان لە چەمکە هەڵە و ساختە و پووچەکان پڕ دەبێت و وەك گۆڕەپانێکی لێ دێت بۆ ململانێی وەسوەسەکانی شەیتان لە دەمی ڕووبەڕووبوونەوەمان لەگەڵ ڕووداوەکاندا. خۆ جگە لە لاوازیی جیهانی ڕۆحیمان و خۆراك پێنەدانی بە شێوەی پێویست و سەرباری ئەمە، هەموو ڕۆژێکیش ئەو گومان و دوودڵی‌یانەی دەرخوارد دەدرێت کە هیچ بەڵگە و پاڵپشتێکیان نی‌یە. ئەمەش گیروگرفت و موسیبەتێکی گەلێ سامناکە، چونکە نەك هەر تەنها دەبێت بە هۆی لەڕێترازانی وەچەی نوێ، بەڵکو پارێزگاری کردنی مانەوەی بەرەی ئێستاش لەسەر ڕاستەشەقام دەکات بە کارێکی سەرسوورهێن و دژوار.

لەوانەیە کەسێك هەبێت پێی وابێت کە ئەم چەشنە مەسەلە و بابەتە سادە و ساکارانەی کە بە ڕواڵەت زۆر گرنگ نین زیاد لە پێویست لەسەریان نووسرابێت و بەڵگەیان لەسەر هێنرابێتەوە. بەڵام ئێمە سەبارەت بە "بابەتەکانی ئیمان"ەوە هاوبەشیی کەس ناکەین لەم چەشنە بیر و بۆچوونەدا، چونکە بچووکترین مەسەلە و بابەت کە پەیوەندیی بە عەقیدەوە ببێت لە ڕاستی‌دا بە ئەندازەی هەموو جیهان گەورەیە. هەر لەبەر ئەوەشە کە هەتا زیاتر لێی بدوێین و قسەی تێدا بکەین هێشتا هەر ئەوە دەهێنێت و شایەنیەتی. تکامان وایە ئەو برایانەی کە لەم گۆشەیەوە دەڕواننە ئەم مەسەلانە، بێزار نەبن و چاوپۆشیمان لێ بکەن.

* * *

**پرسیاری حەوتەم**

ئەگەر زووتر کات و چۆنێتیی ئەجەل دەستنیشان کراوە، ئیتر تاوانی بابای "قاتڵ" چی‌یە؟

وەڵام: بەڵێ، کات و چۆنێتیی مردن - وەك هی هەموو شتێکی تر - پێشتر دیاری و دەستنیشان کراوە. بەو واتایەی کە ئەو شتەی سەبارەت بە سەرجەمی بوونەوەرانەوە

واریدە و ڕوودەدات، سەبارەت بە ژیان و مردنی مرۆڤیشەوە بە هەمان جۆرە. چونكە ئەو حەقیقەتەی كە لەم بوارەدا ناتوانرێت پشت گوێ بخرێت بریتیە لە: هاتنە وجوودی هەموو بوونەوەرێك بە چەند ڕێگایەكی تایبەتی و ئنجا بەسەربردنی ژیانیشی بەپێی چەند بناغەیەكی دیاری كراو، پاشان دوای تەواو كردنی ماوەیەكی دەست‌نیشان كراویش، لەسەر شانۆی ژیان دەكشێتە دواوە.

بەڵێ، هەموو شتێك بەپێی نەخشە و پلانێكی دەست‌نیشان‌كراو كە بۆی كێشراوە و لە ناوەندی بازنەیەكی گشتی و تەواو فراوانی قەدەردا: لە دایك دەبێت و.. گەشە دەكات و.. ئنجا دەمرێت. ئەمە یاسا و سیستەمێكی گشتی و ئەزەلی‌یە كە هەرگیز ئاڵوگۆڕی بەسەردا نایەت.

بەپێی دەستوور و بناغە گشتی و ڕەگ‌داكوتاوەكانی زانستی نوێ، كە لە ناخی ئەم گەردوونەوە هەڵقوڵاون، ئەو گەردوونەی كە بەپێی سیستەمێكی یەكجار ورد و پێكەوەگونجاێكی ناوازەی سەرسووڕهێن كار دەكات.. لەم دەستوور و بناغە گشتی‌یانەوە دەردەكەوێت كە: هەموو شتێك، هەر لە گەردیلەكانەوە تا دەگاتە گەلەستێرەكان: پێشتر تەقدیر و دەست‌نیشان‌كردنێكی تایبەتیی هەیە و، گەر بەم چەشنە دەست‌نیشان كردن و نەخشە و پلانە پێش‌وەختە نەبێت هەرگیز ناتوانرێت ڕێسای ناوازەی گەردوون و پێكەوەگونجانی ڕەنگینیی ناوی ڕوون بكرێنەوە، تەنانەت ناشتوانرێت لە زانستە ڕووتەكاندا هیچ پێشكەوتنێك بەدەست بهێنرێت.

هەر ئەو سیستەمە ورد و ئەندازیاری‌یە ڕەنگینەی ناو ئەم گەردوونەیە - كە بەپێی چەند یاسایەكی بیركاریی ورد كار دەكەن - مرۆڤیان هانداوە كە بەپێی چەند بناغەیەكی دیاری كراو لە ئەزموونگەكانی فیزیادا باس و لێكۆڵینەوەكانیان ئەنجام بدەن و، بەپێی چەند دەستوورێكی تایبەتیش لە زانستی توێژكاری(علم التشريح) بكۆڵنەوە، یان برۆنە ناو قووڵایی گەردوونەوە. چونكە گەردوونێك گەر ڕێسای تێدا نەبێت و.. جیهانێك گەر نەخشە و پلانی بۆ دانەڕێژرابێت و.. كۆمەڵە بەشێكی سروشت كە بەپێی سیستەم و ڕێسا كار نەكات، هەرگیز ناتوانرێت بابەتە زانستی‌یەكانیان تێدا باس بكرێت. تەنانەت سەرجەمی "زانستەكان" لە حەقیقەتدا بریتین لە چەند كامێرایەك بۆ پیشاندانی هەندێ دەستوور و یاسای ناو گەردوون و، هەر لەم ڕێ‌یەشەوە لە ژێر ناونیشانی "زانستەكان"دا ڕۆشتوونەتە ناو دووتوێی كتێبەكانەوە!

بێ گومان ئێمە مەبەستمان ئەوە نی‌یە لە گرنگی و شان‌وشكۆی زانستەكان و دۆزینەوە نوێكان كەم بكەینەوە، نەخێر.. بەڵكو دەمانەوێت ڕێ و شوێنیان یاد

بخەینەوە و سەرنجی مرۆڤیش بۆ لای شتێکی لە زانستەکان گرنگتر ڕابکێشین کە بریتی‌یە لەو سیستەم و پێکەوە گونجانە ناوازەیەی کە هەر لە مێژە لە گەردووندا هەن، تەنانەت پێش ئەوەش زانستەکان بیاندۆزنەوە و پەردەیان لەسەر هەڵبماڵن، ئەو ڕێسایەی کە بە وێنەی دڵێکی لێدەر و زیندوو وایە لە جەستەی ئەم گەردوونەدا.

ئەو "توانست"ە چەندە مەزنە کە بەپێی نەخشەیەکی "قەدەری"ی پێشتر بایەخی بەم ڕێسا ناوازەیە داوە و کردوویەتی بە بناغەیەك بۆ سەرتاسەری گەردوون! تەنانەت هەندێ لە زانایانی "کۆمەڵناسی" دەیانەوێت ئەم یاسا زاڵ و فەرمانڕەوایانەی ناو جیهان (کە لە شوێنێکی سەرووترەوە نازڵ بووە) بەسەر کۆمەڵگاکانی مرۆڤیش‌دا پیادە و جێ‌بەجێ بکەن! خۆ هەرچەندەش بانگەشە کردن تا ئەم ڕادەیە بۆ "قەدەر" یان بە دەربڕینێکی ڕاست و دروست بۆ: "جەبرییەتی زیاد لە پێویست" هەمیشە ڕەخنە و ئیعتیرازی ئاراستە دەکرێت، بەڵام لە ڕووی دانان‌دا بەو ڕێسا فەرمانڕەوایەی ناو جیهان و بەو نەخشە و پلانە ئەزەلی‌یە پێشینە، جێی بایەخە و ناوەڕۆك و واتایەکی قووڵی تێدایە!

لە ڕاستی‌دا هەر "حەقیقەت"ێك کە پەیوەندیی بە "عەقیدە"وە بێت، پێویستی بە پشتگیری و تەسدیقی دەرەوەی خۆی نی‌یە. بەڵام وەچە و بەرەی بێ‌بەختی ئێستا، کە بەهۆی گەلێ ڕوانین و بۆچوونی بیانی، چاوی گرفتاری نابینایی بووە و دڵیشی لە ڕێی چەند وڕێنەیەکی دەرەکیی بیانی‌یەوە لە ڕێ ترازاوە، کاتێ کە پێی دەڵێین: بۆ سەر بیر و ژیری و هۆشی خۆت بگەڕێرەوە، دەبێ لە گەڵ ئەم ڕێنمایی‌یەدا - تەنانەت گەر بە ئاماژە بۆ کردنیش بووبێت - ئەو ناسازی(تناقض)یەی بۆ ڕوون بکەینەوە کە لە گوفتاری ئەو کەسانەدا بەدی‌دەکرێن کە ئەمانیان - بێ‌سوود - لە ڕێ ترازاندووە! هەر لەبەر ئەمەش بوو کە درێژەمان بە قسەکانمان دا و ڕۆشتینە دەرەوەی باسەکە. دەنا جموجوڵی سەرتاسەری گەردوون، هەر لە گەردیلەکانەوە تا دەگاتە گەلەستێرەکان، بەپێی ڕێسایەکی یەکجار ورد و پێکەوە گونجانێکی کامڵ و ناوازە و تەقدیر و دیاری کردنێکی پێشتر کە هەموو شتێکی ناو گەردوون پێکەوە گرێ دەدات، ئەنجام دەدرێن و، ئەمانەش هێندە ڕوون و ئاشکران کە لە پێش‌چاوی هەموو کەسێکدان. خۆ ئەمەش بەڵگەیە لەسەر فەرمانڕەوایەتی‌یەکی زاڵ و ڕەها. جا هەموو جیهانەکانی ناو گەردوون هەر لەو دەمەوە کە خوای گەورە بەدیی‌هێناون و تا ئێستا، ملکەچی ئەم فەرمانڕەوایەتی‌یە ڕەهایەن و، لە هەموو جموجوڵ و ئاڵوگۆڕێکیان‌دا بە تەواوەتی سەریان بۆ نەوی کردووە.

هەرچەندەش "بەدیهێنانی یەکەم" سەبارەت بە سەرجەمی بەدیهاتووانەوە تەنانەت مرۆڤ و ئەوانەش کە وەك مرۆڤ خاوەنی ویست و سەربەستین، بەدیهێنانێکی "جەبری" بووە بە تەواوەتی، کەچی لە پاشاندا ئەم بوونەوەرە خاوەن ویست و سەربەستییانە، لەو شتانەدا کە سەر بە ویستی خۆیانن، لە بەدیهاتووانی تر جیا دەبنەوە. هەر لەبەر ئەم جیابوونەوەیەشە کە "دەستنیشانکردنی پێشین"ی ئەوان شێوەیەکی تایبەتیی لەخۆ گرت.

لە ڕاستیدا پرسیارەکە لە پەینەبردنەوە بەم لایەنە جیاوازەی مرۆڤ سەری هەڵداوە و، هی ئەوەیە کە مرۆڤیشی وەك شتانی تر داناوە. بۆیە ئێمە پێمان وایە کە هەستکردن بەم جیاوازییەی نێوان مرۆڤ و بوونەوەرانی تر - تەنانەت جیاوازیی لەگەڵ هەندێکیاندا - گرێی ئەم مەسەلەیەمان بۆ دەکاتەوە. بەڵام پاشماوەی مەسەلەکە لە ڕاستیدا بریتییە لە قبووڵکردنی گشتگیری(إحاطــــة)ی زانستی ئەزەلیی خواوەند سەبارەت بە هەموو شتێك.

بەڵێ، مرۆڤ - بە پێچەوانەی بەدیهاتووانی تر - قابیلییەت و توانای سەربەستی و ویست و مەیل و ئیختیاری تێدایە و، بەپێی هەموو ئەمانەش: "خێر و شەڕ" و "پاداشت و سزا"ی دەدرێتە پاڵ.

خۆ هەرچەندەش ویست و مەیلی مرۆڤ لە بەردەم گەورەیی ئەنجام وداهاتەکانی ئەو ویست و مەیلەدا بچووك بێت، کەچی خوای گەورە وەك مەرج و هۆکارێك ویستی مرۆڤی قبووڵ کردووە تاکو ئەم شتە جوزئییەی کە پێی دەڵێین: "ویستی مرۆڤ" لە شێوەی مەیلکردنی مرۆڤدا بەرە و "خێر" یان "شەڕ" دەربخات و، ئیتر مرۆڤیش لە ئەنجامی ئەمەدا و بە گوێرەی ئاراستەکردنی ئەو ویستەی خۆی بەرەو کردەوەی چاك یان خراپ بە "تاوانبار" یان "بێ تاوان" لە قەڵەم دەدرێت. خۆ ئەو ڕووداوەی کە ئەنجامی ئەم مەیلەی مرۆڤە، با زۆر قورسیش بێت و لە تواناادا نەبێت لە کۆڵی مرۆڤ بنرێت، کەچی هەر لە ئەستۆی مرۆڤدایە، چونکە خۆی داوای کردووە و مەیلی بەلایدا بووە و خواستوویەتی. بۆیە تۆڵە و پاداشت بۆ مرۆڤە کە دەستنیشان دەکرێن و، خوای گەورە هەرگیز مەسئوولییەتی ئەو کارانەی نادرێتە پاڵ کە تەقدیری کردوون و لە کاتی دیاری کراویشدا بەدیی هێناون.

با لە ڕووناکیی ئەم نموونەیەی خوارەوەدا لەمە تێبگەین:

گەر بەدیهێنەری مەزن ڕووداوێکی گەورەی وەك گۆڕینی وەرزەکانی بە هەناسە هەڵکێشان و هەناسە دەردانی ئێمەوە بەست و، فەرمووی: ئەگەر زیاد لەم ڕادەیە

هەناسە هەڵبکێشن و دەری‌بدەن ئەوا باری جوغرافیای شوێنەکەتان بۆ دەگۆڕم و، ئێمەش بەپێی دەستووری: "تناسب العلية" پەیوەندیمان لە نێوان هەناسەدانی خۆمان و وەرزگۆڕین‌دا نەبینی و، لەم ڕێیەوە لە فەرمانی دەرچووین و، ئەویش بەپێی بەڵێنەکەی خۆی وەرزەکەی ئێمەی گۆڕی.. ئەوا "بەرپرسیاری" تەنها لە ئەستۆی خۆماندایە، چونکە خۆمان بووین بە هۆکاری ئەو ئاڵوگۆڕە، با ئەو کارەش گەلێ لە سەرووی وزەی خۆمانەوە بێت.

هەر بە وێنەی ئەم نموونەیە: هەموو مرۆڤێك بەپێی ئیختیار و ویستی جوزئیی خۆی و لەبەر ئەوەی هۆکاری هاتنەدیی ئەو ئەنجامانەیە کە لەم ویست و ئیختیارەیەوە پەیدا دەبن، بە "تاوانبار" یان "بێ‌تاوان" دادەنرێت.

با ئێستاش نەختێ لەسەر کەرتی دووهەمی مەسەلەکە بدوێین، واتە چۆنێتیی یەکخستن لە نێوان: "زانستی هەمەلایەنگری خواوەند" و "ویستی مرۆڤ"دا:

هەموو شتێك لە زانستی خوادا لەگەڵ شتانی پشت و تەنیشتیەوە و هاودەم لەگەڵ هۆکار و ئەنجامەکانی‌دا هەموو پێکەوەن، بە ڕادەیەك کە: پێشتر و دواتر، هۆکار و ئەنجام، کوڕ و باوك، بەهار و هاوین، هەموویان لە یەك خاڵدان و، تێکڕا دوو ڕووی یەك شتن و، "پێشتر و دواتر" و "هۆکار و ئەنجام" پێکەوە دەزانرێن.

کەواتە هەر کەسێك مەیلەکەی لە هەر شێوە و بە هەر ئاراستەیەکدا بێت و ویستی خۆیشی - کە مەرجێکی عادی‌یە - بە هەر لایەکدا بەکاربهێنێت، پێشتر لە زانستی خوادا هەموو ئەمانە زانراون. هەر لەبەر ئەمەشە کە تەقدیر و دەست‌نیشان‌کردنی ئەو ئەنجامانەی کە لەم هۆکارانەوە پەیدا دەبن، نە ویستی مرۆڤ دەبەستنەوە و نە زۆریشی لێ دەکەن بۆ هیچ شتێك، چونکە کاتێ ئەم تەقدیرانە سەبارەت بە مرۆڤ تەقدیر کراون مەیلی مرۆڤیان تێدا ڕەچاو کراوە. کەواتە ویستی مرۆڤ لە مەسەلەکەدا وەرگیراوە و گرنگیی دراوەتێ. نموونەی ئەمە وەك ئەوەی کە:

ئەگەر کەسێکی مەزن بە خزمەتکارەکانی بڵێت: هەرکات کۆکەی خۆتان گرت و نەکۆکین و نەتانهێشت دەنگتان دەربێت ئەوا دیاریی زۆرتان دەدەمێ، بەڵام گەر کۆکەی دەستکردتان لە خۆتان هێنا، ئەوا لەو دیاریانە بێ‌بەش دەبن. کەواتە لێرەدا ئیرادە و ویستی ئەوانی وەرگرتووە و ڕەچاوی کردووە.

لێرەش‌دا بە هەمان جۆرە، چونکە گەر خوای گەورە بە یەکێك لە بەندەکانی خۆی بڵێت: "گەر مەیلت بەم لایەدا دەربخەیت ئەوا منیش ئەو شتەت بۆ بەدی‌دەهێنم کە مەیلت لایەتی و، هەر لە ئێستاشەوە تەقدیر و دەست‌نیشانی دەکەم بەپێی مەیلەکەی خۆت". کە ئەمەش وا دەگەیەنێت خوای گەورە گرنگی‌یەکی بە "ویستی مرۆڤ" داوە.

لەسەر ئەم بناغەیە، دەتوانین بڵێین: هەروەك خوای گەورە لە تەقدیر و دەست‌نیشان کردنی سەرەتادا هیچ کەسێکی نەبەستووەتەوە و پابەندی نەکردووە، بە زۆرە ملێش شتێکی لە کردەوەکانی مرۆڤی بە پێچەوانەی ڕەزامەندیی مرۆڤەکە بەدی نەهێناوە.

پاشان دەبێ بزانین کە قەدەر و دەست‌نیشان کردنی سەرەتا و پێش‌وەخت بریتی‌یە لە نەخشە و پلانی زانستی خوای گەورە، گەر ئەم تەعبیرە دروست بێت. واتە خوای گەورە بە زانستی هەمەلایەنگیری خۆی پێشتر دەزانێت کە چ مرۆڤێك مەیلی بە چ ئاراستگەیەکدا هەیە و لە دواییش‌دا ئەو مەیلەی بەو جۆرە بۆ بەدی‌دەهێنێت و هەموو ئەمانەشی لە نەخشە و پلانێك‌دا بۆ دادەنێت.

خۆ ئەم "زانین"ەی خواوەندیش - کە وجوودێکی عیلمی‌یە - هیچ شتێك لە دەرەوەدا بە هیچ شێوەیەك بەدی‌ناهێنێت، بەڵکو "توانست" و "ویست"ی خواوەندی بەدیهێنەر ئەو شتە لە دەرەوە لەسەر شێوەیەك بەدی‌دەهێنن بەپێی ئەو مەیلانەی کە مرۆڤ دەری‌خستوون. کەواتە ئەو شتانەی هاتوون یان دێنە وجوود لەبەر ئەوە نەهاتوون کە زووتر لە لایەن خواوەندەوە زانراوە بەم جۆرە دێن، بەڵکو عیلمی ئەزەلی و هەمەلایەنگری خواوەند زانیویەتی بەو شێوە و جۆرانە دێن بۆیە هەر بەو جۆرەش زانراون. کە ئەمەش بریتی‌یە لەو تەقدیر و دەست‌نیشان کردنە بنەڕەتی و پێشینەی یەکەم جار.

زانایانی کەلام ئەم چەمکەیان بە: "العلم تابع للمعلوم" دەربڕیوە. واتە ئەو شتە لە دوایی‌دا لەسەر چ شێوە و چۆنێتی‌یەك بێت، پێشتر بەو جۆرە دەزانرێت، نەك بە پێچەوانەوە، واتە نەك: بۆیە وا هاتووەتەدی چونکە پێشتر وا زانراوا! چونکە هەروەك نەخشە و پلانە زانستی‌یەکانمان ئەوە ناگەیەنن کە تەنها بە نەخشەدانانەکە ئەو شتانەی تەسەوورمان کردوون، بێنەدی.. بە هەمان جۆر مەرج نی‌یە دەست‌نیشان کردنە بنەڕەتی‌یەکان، کە بە نەخشە و پلانی بەدیهێنەریان دادەنێین، هیچ شتێك لە دەرەوەدا بهێننە وجوود.

**پوختەی قسە:**

خوای گەورە بە زانستی فراوان و هەمەلایەنگری خۆی و ئاگاداریی لە شتانی پێشین و شتانی دوایین - بە وێنەی زانین و ئاگاداریی لە ئەنجامەکان - لە هۆکارەکانیش ئاگادارە و.. بە وێنەی زانین و ئاگاداریشی لە هۆکارەکان، زانا و ئاگادارە بە ئەنجامەکانیش. چونکە خوای گەورە بە زانستی ئەزەلی و ڕەهای خۆی پێشتر زانیویەتی

کە چ کەسێك نییەتی باشی هێناوە کردەوەی چاك بکات و، کێی تریش دەیەوێت کردەوەی خراپ بکات. ئنجا بەپێی ئەم نییەت و هەوڵانەی مرۆڤەکان ئەو شتانەی لە کاتی ئەنجامدانی ئەو کردەوانەدا و بەپێی مەیل و نیاز و نییەتی بەندەکەی ئەو شتانە بەدی‌دەهێنێت کە ویستی خۆی پێشتر تەقدیری کردوون.

لەبەر ئەوە، دەست‌نیشان کردنی سەرەتا و پێشینی مردنی کەسێك و چۆنێتیی مردنەکەی و ئەوەش کە یەکێکی تر هۆکار بووبێت لە ڕووداوەکەدا، هەرگیز "بەرپرسیاری" لەسەر هۆکارەکە هەڵناگرێت، چونکە ئەو تەقدیرە پێشینە ویست و سەربەستیی مرۆڤی تێدا ڕەچاو کراوە، بۆیە تاوانەکەی دەدرێتە پاڵ و موحاسەبە دەکرێت لەسەری.

پێمان وایە سەردانەوە لە سەرچاوە بنەڕەتی‌یەکان بۆ ئەم مەسەلە قووڵەی "قەدەر" و لێکۆڵینەوەی یەك لە دوای یەك تیای‌دا، کارێکی پێویست بێت. چونکە ئەوەی کە لێرەدا ڕوونمان کردەوە تەنها ڕوونکردنەوەیەکە بۆ "ئاستی عەوامەکان" لە ناوەندی بناغە مەحکەم و قایمەکانی زانایانی سەلەفدا.

* * *

**پرسیاری هەشتەم**

"ئیرادەی کوللی" و "ئیرادەی جوزئی" چین؟

**وەڵام:** ئیرادەی کوللی ئەو ویستەیە کە لە لایەن عەوامەوە دەدرێتە پاڵ خوای گەورە. بەڵام ئەم زاراوەیە لە سەردەمی هاوەڵان و تابیعین و شوێنکەوتووانی تابیعین‌دا نەبووە و، هەرگیز ئەوان بە ویستی خواوەندیان نەوتووە: "ئیرادەی کوللی" و بە هی مرۆڤیشیان نەوتووە: "ئیرادەی جوزئی". لەگەڵ ئەوەش‌دا وا دیارە بە ڕواڵەت هیچ ڕێگرێکی ئەوتۆ لە دانانی زاراوەیەکی وەك ئەمەدا نەبێت، تاکو ئەم مەسەلەیە لە عەوامەکان بگەیەنرێت. ئەوەش هەیە کە دەرگای ئەم قسەیەم لەسەر پشتە بۆ ئاراستەکردنی هەر ڕەخنەیەك.

لە ڕاستیش‌دا زاراوەی وەك ئەمە: تەعبیر و هەڵسەنگاندنێکی سروشتی‌یە بۆ ئەنجامی بەسەرهات و ڕووداوەکان و لەوێوە سەرچاوەی گرتووە. لەبەر ئەوە، دەتوانرێت بە "خاڵێکی پشت پێ‌بەستن"ی ڕاست و دروست دابنرێت. مەبەست لەو "ئیرادە کوللی"یەی کە بۆ ویستی خوای گەورە بەکارهێنراوە ئەم واتایانەی خوارەوەیە کە بریتین لەوەی: (هەرچی ویست و ئیرادە هەیە تایبەتە بە خوای گەورەوە و وشەی

"ئیرادە" ناوە بۆ ویستی خوای گەورە و، هەرکات ویستی لەسەر بەدیهێنانی هەر شتێك بێت بەدیی دەهێنێت، بێ ئەوەی سەیری ویستی کەسی تر بکات).

لێرەدا دەمانەوێت سەرنجتان بۆ لای شتێك ڕابکێشین کە زووتر باسمان کرد و بریتی‌یە لەوەی هەندێ کەس دەڵێن: "خوای گەورە ئەو شتەی ویستی لەسەری بێت بەدیی دەهێنێت، بەڵام ئەو شتانەی ئیرادەی نی‌یە بۆیان، بەدی‌یان‌ناهێنێت". ئەم گوفتارە گوفتارێکی هەڵەیە! ڕاستەکەشی بریتی‌یە لەوەی کە: هەر شتێك خوای گەورە ویستی لەسەری بێت بەدیی بهێنێت، بەدیی دەهێنێت.. هەرشتێکیش ویستی لەسەری بێت بەدیی نەهێنێت، بەدیی ناهێنێت: (ما شاء الله کان وما لم یشأ لم یکن)!

گەردوون "جەبر"ی تێدا زاڵ و فەرمانڕەوایە. ئەوەتا کاتێ خوای گەورە گەردوونی بەدی‌هێناوە، پرسی بە کەس نەکردووە و جگە لە ویستی خۆی ویستی هیچ کەسێکی تری نەکردووە بە بناغەی ئەم کارەی، چونکە خواوەند: ﴿فعّالٌ لما یُرید﴾ە (البروج:١٦).

بەڵام لە کارە ئیرادی‌یەکانی مرۆڤدا "ویست"ی بە مرۆڤ بەخشیوە و ئەو ویستەش هۆکارێکە بۆ "بەرزبوونەوە" یان "نزم‌بوونەوە"ی مرۆڤ. بەخشینی ئەم ویستەش لە لایەن خواوەندەوە بە مرۆڤ پەیوەندیی بە دوو ناوی: "الرحمن الرحیم"ی خواوەندەوە هەیە. واتە ئەم ویستەی کە بە مرۆڤی داوە، لوتفێکی خواوەندە کە بە درەوشانەوەی ئەم دوو ناوەی پێی بەخشیوە. دەنا گەر لە گۆشەی ئیسمی ئەعظەم و لەفظی جەلالە(الله)وە سەیری شتان بکەین، دەبینین سەرتاسەری گەردوون لە جەبرێکی ڕەهادایە. بەڵێ، دەستووری: "مالك الملك یتصرف في ملکه کیف یشاء" لە هەموو بوونەوەراندا دەست‌بەکارە، جگە لە کردەوە ئیرادی‌یەکانی مرۆڤ. چونکە مرۆڤ لەو کردەوانەدا ویستێکی ماهییەت نەزانراوی دراوەتێ و ئەو ویستەشی لەو کردەوانەی‌دا ڕەچاو دەکرێن. خۆ هەرکات مرۆڤ ئەم ویستەی خۆی بەرەو کاری چاکە و خێر ئاراستە کرد، خوای گەورە "خێر"ی بۆ بەدی‌دەهێنێت و، گەر بەرەو شەڕیش ئاراستەی کرد "شەڕ"ی بۆ بەدی‌دەهێنێت، گەر ویستی لەسەر بێت. تەنها پشت‌بەستنیشمان بە ڕەحمانییەت و ڕەحیمییەتی خوای گەورە ئێمەی بەرەو پرکێشی و جورئەت کردن لەم حوکمەدا دایەبەر!

واتە ئێمە باوەڕمان وایە کە هەر کات ویستمان لەسەر ئەنجامدانی کردەوەی خێر بوو، ئەوا بە بێ گومانی خوای گەورە بەدیی دەهێنێت بۆمان. بەڵام هەندێ جار - بە لوتف و کەرەمی خۆی - ئەو "شەڕ"ە بەدی‌ناهێنێت کە ویستی مرۆڤی بۆ ئاراستە دەکرێت. بۆ نموونە: کەسێکی گومڕا دەیەوێت هەموو هۆکارێك بخاتە کار و مرۆڤێك

گومڕا بکات و لە ڕێ بیترازێنێت و، ئەمیش مەیلی دەچێت بەلای‌دا، بەڵام خوای گەورە نایەوێت لە ڕێ بترازێت و گومڕایی سەبارەت بەو بەدی‌ناهێنێت، لەبەر کردەوەیەکی چاکی ئەو مرۆڤە کە زووتر کردوویەتی، یان لە ئایندەدا دەیکات و زانستی خوا ئاگای لێ‌یەتی. تەنانەت هەندێ جار خوای گەورە تەگەرەیەك دروست دەکات کە بە هۆیەوە لەو کردەوە خراپە دووری دەخاتەوە. کە ئەمەش بەخششێکی پەروەردگاری‌یە. تەنانەت بەهەشت خۆیشی، لەبەر ئەوەی لە ڕوویەکەوە پەیوەندیی بە خستنەگەڕی ویستی مرۆڤەوە هەیە، ئەوا خوای گەورە ئەو شتانەی تێدا بەدی‌دەهێنێت کە بە نیاز و ناوی خێرەوە مرۆڤ ویستی لەسەریان بووە و، هەر هێندە بەسە کە مرۆڤ گوناهێکی وا گەورە ئەنجام نەدات کە هەموو خێرەکانی بسڕێتەوە و لە شایستەیی چاکە و بەخششی خوا بێ‌بەشی بکات.

* * *

**پرسیاری نۆهەم**

تکایە یاسای: "بەخششی خوای گەورە"(عطاء الله)مان بۆ ڕوون بکەرەوە.

**وەڵام:** بەخشش(العطاء) لە زماندا بە واتای لوتف و چاکە و پێ‌بەخشین دێت.

ئەوەش کە لەم مەسەلەیەدا پەیوەندیی بە باسەکەمانەوە بێت ئەو لایەنەی "عطـــاء"ە کە پەیوەندی بە قەزا و قەدەرەوە هەیە..

مرۆڤ گەر ویستی لەسەر کردەوەی خراپ بێت خوای گەورە ئەو کردەوە خراپەی بۆ تەقدیر دەکات، چونکە تەقدیراتی لەمەڕ مرۆڤ "ویستی مرۆڤ" ڕەچاو دەکات.

بۆ نموونە: گەر پێش ئەوەی دەستم بەرز بکەمەوە، "دەست بەرزکردنەوە"م بۆ تەقدیر کرابێت ئەوا لەبەر ئەوە بۆم تەقدیر کراوە کە زانستی ڕەها و هەمەلایەنگری خواوەند زانیویەتی من مەیل و ویستی خۆم بەرەو ئەو کارە دەخەمە گەڕ. چونکە سیفەتی "زانستی خوای گەورە" دەوراندەوری هەموو شتێکی، کە بووە یان دەبێت، تەنانەت دەوارندەوری زاتی مەزنی خواوەندیشی داوە. بۆیە دەزانێت من چ کارێك ئەنجام دەدەم، ئەویش لەسەر ئەو شێوەیە تەقدیری دەکات بۆم: (فلانە بەندەم مەیلی ئاراستەی بەرزکردنەوەی دەستی دەکات، منیش ئەو بەرزکردنەوەیەی لەو کاتەدا بۆ بەدی دەهێنم) یان (ئەمەم بەم جۆرە نووسیوە). کە ئەمەش بریتی‌یە لە "قەدەر". واتە نووسینی ئەمە بەم شێوەیە بریتی‌یە لە "قەدەر". بەڵام کاتێ کە دەستم بەرز دەکەمەوە ئەوە "قضاء"ە، واتە هێنانەدیی ئەو شتەیە کە پێشتر بۆم تەقدیر کرابوو.

بەڵام بەخشش(العطاء) دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە لێی تێبگەین:

"بەندە" ویست و مەیلی خۆی بەرەو کردەوەی خراپە و شەڕ دەخاتە کار، بەڵام خوای گەورە بەخششێکی تایبەتیی بۆ دەخاتە کار و نایەڵێت گرفتاری ئەو خراپە و شەڕە بێت، ئیتر چ لەبەر بارودۆخێکی باشی ئەو بەندەیەی بێت، یان لەبەر ئەوە بێت کە دڵێکی خاوێنی لە خۆدا هەڵگرتووە، یان لەبەر کردەوەیەکی باشی ئەو بەندەیەی، ئیتر بەم بۆنەیەوە ئەو شتە خراپەی کە بۆی تەقدیر کرابوو سەبارەت بەو تەنفیز و جێبەجێ ناکرێت. کەواتە: "عطـاء" کاری لە "قەدەر"دا کرد و قەدەریش کاری لە "قضـاء"دا کرد. بەڵام هەموو ئەمانە لە تۆماری کوژانەوە و نووسین(لـوح المحـو والإثبات)دا ڕوو دەدەن و، هەرگیز هیچ ئاڵوگۆڕێك لە زانستی خوادا ڕوو نادات. کەواتە تۆماری کوژانەوە و نووسین لە ڕوویەکەوە بریتییە لە دەفتەری کردەوەی تایبەت بە هەموو مرۆڤێك و، دەگونجێ ئاڵوگۆڕی تێدا ڕوو بدات. بەڵام هەرگیز ئاڵوگۆڕ لە "لەوحی مەحفووظ"دا ناکرێت.

"عطاء" لوتفێکی خوایییە و، لوتفیش شایستەیی و ئەهلییەت ڕەچاو ناکات و بە مەرجی ناگرێت.

جا ئەگەر لەم گۆشەیەوە بڕوانینە مەسەلەکە، دەبینین کە هەرچی کردەوەی چاکمان هەیە هەموویان بەخششی خوای گەورەن.

* * *

لە دەمی بانگی عەسری ڕۆژی شەممەی ڕێکەوتی ٢٥/ڕەمەزانی/١٤١٨ کۆچی، بەرامبەر ٢٤/١/١٩٩٨ز خوای گەورە، بە عەتا و بەخشش و لوتفی خۆی، وەرگێڕانی ئەم کتێبە بەنرخەی لەسەر دەست ئاسان کردین. لە خوای گەورەی لێبوردەی میهرەبان دەلاڵێینەوە کە بە عەتاء و لوتفی خۆی ئەم کارەمان بە: "صەدەقەی جاریە" و "زانستی سوود لـێ وەرگیراو" بۆ بنووسێت و بمانخاتە ڕیزی ئازادکراوانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزەوە. تکاشمان لە خوێنەری بەڕێز ئەوەیە کە لە پاشملە دوعای خێر بە تایبەتی دوعای لێخۆشبوونمان لە حوزووری خوای گەورەدا بۆ بکات.

وصلى الله على سيدنا محمد وآله وصحبه أجمعين والحمد لله رب العالمين.

**فاروق رسول يحيى**

## پوختەیەك لە ژیانی دانەر:
# (مامۆستا محمد فتح الله گولەن)

❑ لە ساڵی ١٩٣٨ز دا لە گوندی "کۆروجوك"ی قەزای "پاسینلەر"ی سەر بە پارێزگای "ئەرزڕۆم" لە دایك بووە.

❑ باوکی ناوی مامۆستا "ڕامیز" و، ئیمامی مزگەوت بووە.. دایکیشی ناوی ڕەفیعەخان بووە.

❑ دووهەم منالی خێزانەکەیەتی کە هەشت منالبوون، شەشیان کوڕ و دوانیان کچ.

❑ لە تەمەنێکی بچووکدا هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە و، لە لای زانا بەناوبانگەکانی شاری ئەرزڕۆم بە تایبەت لای مامۆستا "عوسمان بەکتاش" وانەکانی خوێندووە. هەروەها ئامادەی وانەی گەورە پیاوانی تەصەووفی ناوچەکەیان بووە.

❑ چوار ساڵ پێش‌نوێژ و وتاربێژ بووە لە سێ مزگەوتی "ئەدیرنە"دا.

❑ دوای ماوەیەك لە "کرك لارەلی" بۆ ماوەی ساڵێك بە "واعیظ" دامەزراوە.

❑ لە ساڵی ١٩٦٦دا بە هەمان ئەرکی "واعیظ"ی نەقلی ئیزمیر کراوە و، لە مزگەوتی "کەستانە پازاری" ئامۆژگاریی پێشکەشی خەڵکی کردووە و هاودەم لەگەڵ ئەوەش‌دا سەرپەرشتیی خولی فێربوونی قورئانی لە "کەستانە پازاری"دا کردووە. لەم ماوەیەدا و هەتا ساڵی ١٩٧١ وەکو واعیظی گەڕۆکی هەرێمەکە، لەسەر وەعظ و ئامۆژگاری و وانە وتنەوە لە قەزا و ناحیەکانی هەرێمی "ئیجە"دا بەردەوام بووە.

❑ هەرچەندە لە بڕیارێکی ساڵی ١٩٧١دا لە کارەکەی دوور خرایەوە، بەڵام بە کەڵك وەرگرتنی لە یاسای لێبوردن گەڕایەوە بۆ سەر کارەکەی.

❑ دوابەدوای ئەم بڕیارە لە قەزای "ئەدرەمیت"ی سەربە شاری بالیکەسیر و لە شارۆچکەی "مانیسا"ش‌دا بەردەوام بووە لە جێبەجێ کردنی ئەرکی وەعظ و ئامۆژگاری، هەتا گواسترایەوە بۆ قەزای "بۆرنۆڤا"ی سەر بە پارێزگای ئیزمیر، ئنجا لەوێش هە تا ١٩٨٠/٩/١٢ لەم کارەی‌دا بەردەوام بوو.

▢ لە دەمی کوودەتای سەربازی و لە پاش کوودەتاکەشدا نزیکەی شەش ساڵ لە کارەکەی دابڕا، چونکە بڕیاری دەستگیرکردنی درابوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٨٦ لە ئەنجامی بڕیاری دادگای ئاسایشی دەوڵەت گەڕایەوە بۆ ژیانی ئاسایی خۆی.

▢ لەبەر داوایەکی زۆری خەڵکی، بێبەرامبەر، دەستی کردەوە بە وەعظ و ئامۆژگاری لە "ئیزمیر" و ئەستەمبووڵ هەتا ساڵی ١٩٩٢.

▢ جگە لە زمانی تورکی، عەرەبی و فارسیش دەزانێت.

▢ لە چەندەها گۆڤار و ڕۆژنامەدا بابەتی بڵاو کردووەتەوە.

▢ ئەمەش ناوی هەندێکە لە بەرهەمە بڵاوکراوەکانی:

١ - بەرەو بەهەشتی نادیار.

٢ - چاخ و نەوە.

٣ - پارچە زێڕەکانی کات.

٤ - ئەو ڕۆژانەی پشوو بە بەهار دەدەن.

٥ - پێوانە، یان ڕووناکییەکانی ڕێگا (چوار بەرگ).

٦ - نووری بێ کۆتایی (سێ بەرگ).

٧ - لە سێبەری باوەڕدا (دوو بەرگ).

٨ - ژیانی دوای مردن.

٩ - کەوانەی ڕەنگەکان (دوو بەرگ).

١٠ - لە وەرزێکەوە بۆ وەرزێکی تر.

١١ - وەڵامی دوودڵییەکانی سەردەم (چوار بەرگ).

١٢ - تەپۆڵکە زمرووتییەکانی دڵ. (دوو بەرگ).

١٣ - قەدەر لە ڕووناکیی قورئان و سوننەتدا

١٤ - جیهاد، یان ئیعلای "کلمه الله".

١٥ - دیوانێکی شیعر.

▢ وەعظ و ئامۆژگارییەکانی بە کاسێتی ئاسایی و کاسێتی ڤیدیۆ تۆمار کراون و، لە لایەن خەڵکییەوە سوودیان لێ وەردەگیرێت.

تا ئێستا دوو کتێب لەسەر ژیاننامە و بەسەرهاتەکانی بڵاوکراونەتەوە.

* * *

# پێرستی بابەتەکان

## بەشی یەکەم:
## قەدەر و لایەنە جیاجیاکانی



## بەشی دووەم
## پەیوەندیی "قەزا" بە "قەدەر"ەوە



## بەشی سێهەم
## پەیوەندیی نێوان: قەدەر، ئیرادە، هیدایەت



## بەشی چوارەم
## چەند پرسیار و وەڵامێك لە بارەی "قەدەر"ەوە

**پرسیاری یەکەم:**

* * *

# (پێرستی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز)

## کە لەم کتێبەدا هێنراون

### بەپێی سوورەتەکانیان

| سوورەت و ئایەت و ژمارەکەی | ژمارەی لاپەڕە |
|---|---|

سوورەتی: (الرعد)



سوورەتی: (الحجر)



سوورەتی: (النحل)



سوورەتی: (الإسراء)



سوورەتی: (الكهف)

سوورەتی: (الحديد)



سوورەتی: (الملك)



سوورەتی: (المدثر)



سوورەتی: (الإنسان)



سوورەتی: (الانفطار)



سوورەتی: (البروج)



سوورەتی: (الليل)

## (پێڕستی فەرموودە پیرۆزەکان)

### کە لەم کتێبەدا هاتوون

### بەپێی یەکەم پیتیان

گەلێ فەرموودەی پیرۆز لەم کتێبەدا هێنراون و لە پەراوێزەکاندا تەخریجێکی پوختیان بۆ دانراوە. هەندێك لەو فەرموودانەش واتاکەیان بە کوردی و ئەوانی تریش دەقەکانیان بە عەرەبی نووسراوە. جا ئەم پێڕستە تەنها ئەم بەشەی دوایی دەگرێتەوە. (وەرگێڕ)

| دەقی فەرموودەکە | لاپەڕەکەی |
|---|---|

#### پیتی (أ)

* * *

**تێبینییەك:**

ئەم بەرهەمەی كە ئێستا لە بەردەستی خوێنەری بەرێزدایە چەند دەستێكی ڕەنگین بەشداریی ئیجابی و لەبەرچاویان لە قۆناغەكانی ئامادەكردنیدا كردووە. جا هەرچەند من گومانم لەوەدا نییە كە حەز بە ناوهێنانیان ناكەن و قبوولبوونی لای خوای گەورەیان سەرزیادە، بەڵام وەك ئەمەكدارییەك وا ناوی هەندێكیان دەنووسین و، هیواداریشین لای خوای گەورە پاداشتێكیان بدرێتەوە كە شایانی كەرەمی خواوەند بێت:

كاك شازاد: نووسینەوەی ڕەشنووس و پاكنووسی ئەم كتێبە.

كاك هۆشیار: تایپی كۆمپیوتەر.

كاك شێخ خالید: لەگەڵ ئەو دوو ناوبراوەدا هاوبەشیی ورد و لەسەرخۆی لە بژاركردن و هەڵەگیریی چاپ و پێداچوونەوەیدا كردووە.

كاك ئەحمەد: پوختە ژیانەكەی دانەری لە زمانی توركییەوە كرد بە كوردی.

خێرەومەندێكیش - كە داوای كرد ناوی نەهێنم - ئەركی چاپی گرتەئەستۆ.

* * *

# القدر

## في ضوء الكتاب والسنة

ألفه باللغة التركية العالم الفاضل الشيخ:

**محمد فتح الله گولَن**

نقله من التركية إلى العربية الأستاذ:

**إحسان قاسم الصالحي**

ترجمه من العربية إلى اللغة الكردية:

**فاروق رسول يحيـــى**

* * *

**ژمارەی سپاردن ( ١٢٥ ) ساڵی (٢٠٠١)**

**چاپخانەی ( نـــازە / هـەولێر )**

## ئەم کتێبە

لـەو کاتـەوە کە مرۆڤ لەسەر ئەم هەسارەیەدا خۆی بینیوەتەوە و بیری لـە دیاردەکـانی دەوروبـەری کـردووەتەوە، دەیـان پرسیاری لەبارەی "قـەدەر" و "ویسـت"ی خـوای گـەورە و "ویسـت"ی مـرۆڤەوە لە لا گەڵاڵە بوون. ئایینی ئیسلامیش لە ناوەندی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و سـوننەتی خاوێـنی پێغەمـبەرەوە ﷺ وەڵامـی ئـەو پرسـیارانەی مـرۆڤی داوەتەوە و لـە سەرسامی‌یەکانی ڕزگاری کردووە.

ئەم کتێبەش هەوڵێکی پێشکەوتووە لـە خستنەڕووی ئەو لایەنەی قورئان و سـوونەتدا بـۆ مـرۆڤی بەویژدانی هاوچەرخ ، بە تایبەت لـە وەڵامی ئەو پرسیارانەی کە زیاتر لەم سەردەمەدا ورووژێنراون و لـە بێ‌ئاگایی و نەشـارەزایی مـرۆڤەوە لـە سروشتی پەیوەندیی نێوان بەندە و خواوەندی پەروەردگارەوە سەرچاوەیان گرتووە.